حکومەتی هەرێمی کوردستان – عێراق
وەزارەتی پەروەردە
بەڕێوەبەرایەتی گشتی پرۆگرام و چاپەمەنییەکان

# پەروەردەی ئیسلامی

## بۆ پۆلی نۆیەمی بنەڕەتی

دانانی

عبد الله عبد الرحمن بابان | فاروق محمد علی عباس | واحد حمە صالح
عبد الجبار محمد شریف | ئازاد عمر سید أحمد | خواجە طە شاهین

وەرگێڕانی

عبدالقادر امین احمد

چاپی یەکەم
٢٠١٥ زایینی ٢٧١٥ کوردی ١٤٣٦ کۆچی



بەناوی خودای بەخشندەو میهرەبان

# پێشەکی

ئـەم پەرتوکەـ پـەروەردەی ئیسـلامی بـۆ پـۆلی نۆیـەمی بنـەڕەتی هـەنگاوێکی دیکـەی نێوکـاروانی گۆڕانکـاریو گەشـەپێدانی پرۆگرامـی پـەروەردەی ئیسـلامییە، کـە وەزارەتـی پەروەردە بەلیژنەیەکی پسپۆری سپاردووە.

لەئامادەکردنی ئەم پرۆگرامەدا رەوتێکی نوێ رەچاوکراوە، ئەویش گرینگیدانە بەپەند وەرگـرتن لـەژیانی پێغەمبـەرانو هەنـدێك لـەهاوەڵانو شـوێنکەوتوانو زانایـان، وەك سەرمەشقی خزمەتکردنو بانگەواز بۆئاینی ئیسلام و خوداناسی، ئەمە سەرەرای ئامـاژە پەرستشـیەکان، بەمەبەسـتی بەرچـاو روونکردنـی نـەوەکانمانو شـارەزابوونیان لـەئاینو پەروەردەکردنیان بەشێوەیەك رۆڵی خۆیان بگێرن لەبنیاتنانی ئایندەی نیشتماندا.

وەك لەدەسـتپێکی پەرتوکـە پێشـترەکانی ئـەم پرۆگرامـەدا ئاماژەمـان پێکـردووە، رۆڵی لیژنەکـەمان لێرەدا کۆتـایی پێـدێتو ئـەرکی هاوڕێیـانی پـەروەردەکارمان دەسـت پێـدەکات لەگەیاندنی ئەم پەیامـە بە رۆڵـەکانمان. هـەر کـەم و کوڕیو هەڵـەو پەڵەیەکیشیان بـەدیکرد هیوادارین ئاگادارمان بکەن تا لە چاپەکانی داهاتودا چارەسەربکەین.

لـەخودای باڵادەسـت دەخـوازین هـەموومان سـەرکەوتووبکات بـۆ بـەئامانج گەیانـدنی کاروانی پەروەردەیی لە کوردستاندا.

**لیژنەی ئامادەکار**

(وَقُل رَّبِّ زِدْنِي عِلْمًا)

( طه ١١٤ )

قال تعالى :

((انّا نحن نزلّنا الذّكر وانّا لَهُ لَحافِظون))

(الحجر ٩)

## وانەی یەکەم

# تاك و تەنیای خودای گەورە

ووشەی تاك و تەنیای بۆ خودای گەورە بە واتای ئەوە دێت :

١- خودای گەورە یەکە و تەنیایەو هاوبەشی نییە لە خاوەنداریێتی بۆ بەندەکانی، هیچ دروست کەر و رۆزی بەخش و رێکخەرێك بۆ ئەم گەردوونە نییە جگە لە زاتی ئەو.
(قل هو الله أحد) واتە : ئەی محمد بڵێ خودای گەورە تاك و تەنیایە.

٢- خودای گەورە تاك و تەنیایە هاوبەش و شەریکی نیە لەناوو سیفەتەکانی دا نەکەس لەو دەچێت و نە ئەویش لە کەس دەچێت، نە رکابەر و نە هاوشێوەی نییە. (لیس کمثله شيء)
واتە هیچ هاوشێوەیەکی نییە.

٣- هیچ خوداو پەرستراوێك نیە تەنها (الله) نەبێت. (لا إله إلا الله)

### تاك و تەنیایی خودای گەورە لە پەرستن دا:

مەبەست لە دروست کردنی بوونەوەرەکان(مرۆڤ و جنۆکە)لەلایەن خودای گەورەوە تەنها پەرستن بووە.لە ئایەتی (٥٦ الذاريات). دا هاتووە :

**(وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنْسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ)**

١- پەرستن تەنها بۆ خودای گەورەیە.
٢- تاك پەرستنی خودای گەورە ئەرکی سەر شانی هەموو بوونەوەرێکە.
٣- خودا پەرستی مانای جێبەجێکردنی فەرمانەکانی خودای گەورە و دڵسۆزیە لە بەجێهێنانی سروشتە ئیسلامیەکان و لە هەموو کارێکی چاکدا.

## گفتوگۆ:

١- مەبەست لە درووست کردنی بوونەوەرەکان چییە؟

٢- واتای ئەم رستەیەی خودای گەورە(لیس کمثلە شيء) چییە؟

٣- تاك پەرستی خودای گەورە چۆن دەبێت؟

٤- ئەم بۆشاییانە تەواو بکە:

خودای گـەورە تاکـە و ...................... نیـە لـە خاوەندارێـەتی و ................... لـە ناوەکانی و .......................... دا.

## وانەی دووەم

### توانای خودای گەورە

توانا و دەسەڵات لەسیفەتەکانی خودای گەورەیە و لە زاتی مەزنی خودای گەورە جیا نابێتەوە ﴿...إِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ (البقرة ١٠٩).

واتە (خودای گەورە بە دەسەڵات و توانایە بەسەر هەموو شتەکاندا)

خودای میهرەبان دەفەرموێت: ﴿لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ (التغابن ١).

واتە:(خاوەنداریێتی و ستایش بۆ ئەوە و دەسەڵاتدارە بەسەر هەموو شتەکاندا).

بەڵگەی هەستپێکراو لەسەر تواناو دەسەڵاتی خودای گەورە وەك ئەوە وایە(یەکێك جل و بەرگێکی جوان و رازاوەی ببینێت. کە لە قوماشێکی دەستکرد درووستکرابێت و بە هەموو جۆرە نەخش و نیگارێك رازابێتەوە بڵێت ئەمە دەستکردی بێ گیانێکە یان مرۆڤێکی گێل و بێ توانا ئەنجامی داوە).

**بەڵگەکانی توانا و دەسەڵاتی خودا لە گەردوون دا :**

**دیاردەی یەکەم– دیاردەی سێبەر لە بڵاو بوونەوە و چوونە ناو یەکدا.**

خودای میهرەبان دەفەرموێت: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَىٰ رَبِّكَ كَيْفَ مَدَّ الظِّلَّ وَلَوْ شَاءَ لَجَعَلَهُ سَاكِنًا ثُمَّ جَعَلْنَا الشَّمْسَ عَلَيْهِ دَلِيلًا ﴿٤٥﴾ ثُمَّ قَبَضْنَاهُ إِلَيْنَا قَبْضًا يَسِيرًا ﴿٤٦﴾﴾ (الفرقان).

ئەمە دیاردەی سێبەرە لە کاتی جوڵەیدا. ئەگەر مرۆڤ تەماشای سێبەری شتەکان بکات دەبینێت کە سێبەرەکان بچووك یان گەورە یان پان دەبن و دەچنەوە یەك و جوڵەی سێبەر لەگەڵ جوڵەی زەوییە لە شوێنی نزیکی یان دووری لەخۆرەوە. واتە رۆژ چاوساغی جوڵەی سێبەرەکانە و خودای گەورە ئەیتوانی سێبەر رابگرێت بەڵام نەجوڵانی سێبەر بێ سوود دەبوو بۆ مرۆڤ.

ئەویش خۆپاراستنە لە گەرمی لەکاتی بڵاو بوونەوەی سێبەردا و خۆدانە بەر تیشکی خۆر لە کاتی لاچوونی دا.

مرۆڤیش پێویستی بە هەردوو شێوازەکە هەیە.

**دیاردەی دووەم- دابەش بوونی کات بۆ شەو و رۆژ.**

خودای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَجَعَلْنَا اللَّيْلَ لِبَاسًا ﴿١٠﴾ وَجَعَلْنَا النَّهَارَ مَعَاشًا ﴿١١﴾﴾ (النبأ).

کە خودای گەورە کاتی کردووە بە دوو بەشەوە لەپێناو سوودی مرۆڤ و بەردەوامی لە کارکردن لە رۆژدا و نوێبوونەوەی چالاکییەکانی لەکاتی شەودا و حەوانەوەی لە ماندوێتی رۆژ.

**دیاردەی سێیەم- ناردنی (با) وەك پێشەنگی باران بارین.**

خودا فەرمویەتی: ﴿وَهُوَ الَّذِي أَرْسَلَ الرِّيَاحَ بُشْرًا بَيْنَ يَدَيْ رَحْمَتِهِ وَأَنزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً طَهُورًا ﴿٤٨﴾ لِنُحْيِيَ بِهِ بَلْدَةً مَيْتًا وَنُسْقِيَهُ مِمَّا خَلَقْنَا أَنْعَامًا وَأَنَاسِيَّ كَثِيرًا ﴿٤٩﴾﴾ (الفرقان).

ئەم دیاردەیە (باران بارین) لە دیاردە سروشتیەکانە کە سوودی مرۆڤی تێدا بەرجەستە دەبێت. کە پالاوتەی ئاوی دەریاکان بەهۆی تیشکی گەرمی خۆرەوە هەڵم دەکات و لە شێوەی پەڵە هەورێکدا دەردەکەوێت و (باکان) دەیانخەنە رێ بۆ ئەو شوێنانەی کە وشك و تینوون و پێویستیان بە باران هەیە. دوای ئەوە باران دەبارێت و جۆگەلە و روبارو دەریایان لێ دروست دەبێت یان بەشێکی دەچێتە ژێر زەوی و ئاوی ژێر زەوی پێك دێنێت.



## سودی مرۆڤ لە باراناو:

١- باراناو زەوی ئەژێنێتەوە و گژ و گیای لێ پەیدا دەبێت.

٢- بۆ مرۆڤ و ئاژەڵ پێویستە. بەیەکەوە بۆ خواردنەوە و پاکژکردنەوە و بۆ ئاودێری ئاژەڵ و کشتوکاڵ بەکاردەهێنرێت.

## دیاردەی چوارەم- ئاو سەرچاوەیە بۆ ژیان.

ئەم دیاردەیە سروشتییە بەڵام پەیوەندی بە زۆربوونی مرۆڤ و ئاژەڵ و کشتوکاڵە.

خودای میهرەبان دەفەرموێت: ﴿...وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ...﴾ (٣٠ الانبياء).

چونکە خودای گەورە هەموو بوونەوەرەکانی لە ئاودا درووست کردووە.

## گفتوگۆ:

١-بەڵگە بهێنەوە لەسەر توانا و دەسەڵاتی خودای گەورە بەمەرجێك لەو بەڵگانە نەبێت کە لە کتێبەکەتدا هاتووە.

٢-کات کراوە بە دوو بەشەوە ئ..................... ، ب .....................

٣- کەڵك و سوودی هەرەیك لەمانە بڵێ :

ئ- سێبەر.

ب- رووناکی رۆژ و تاریکی شەو.

پ- با.

ت- زۆربوونی بونەوەران.

ج- باراناو.

٤-ئایەتێك بنووسە کە لەبەرت کردبێت، باس لە (توانا و دەسەڵاتی خودای گەورە بکات)؟

٥- ئەم ئایەتە بە کورتی شی بکەرەوە ﴿...وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ...﴾. (٣٠ الانبياء).

## وانەی سێیەم

# رۆژی دوایی

رۆژی هەستانەوە یان رۆژی دوایی یان رۆژی لێپرسینەوە، بەپێی بیرو باوەری ئاینی ئیسلام کۆتایی گەردوون و ژیانی دونیایە ـ پەیرەوانی ئاینە ئاسمانییەکانی دیکەی وەك جوولەکە و کرستیانەکان هەمان بۆچوونیان هەیە ـ رۆژی دواییش وادەی لێپرسینەوەیە لەگەڵ خەڵك لەسەر کردەوەکانیان لە دونیا، باوەڕدارەکان بە بەهەشت پاداشت دەکرین، وبێ باوەڕانیش بە ئاگر سزا دەدرێن.

قورئان زۆر بایەخی بەباسی رۆژی دوایی داوە، ولە زۆر شوێن باسی کردووە و هۆشداریشی پێداوە، لە گشت بۆنەیەك جەختی لەسەر هاتنی کردووە. لە شێوازەکانی بایەخ دانی قورئان بەرۆژی دوایی:

١ ـ بەستنەوەی باوەڕ پێهێنانی بەباوەڕهێنان بە خودا، هەروەك خودای گەورە دەفەرموویێت:(( لَيْسَ الْبِرَّ أَنْ تُوَلُّوا وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَلَكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ وَآتَى الْمَالَ عَلَى حُبِّهِ ذَوِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَالسَّائِلِينَ وَفِي الرِّقَابِ وَأَقَامَ الصَّلَاةَ وَآتَى الزَّكَاةَ وَالْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَاهَدُوا وَالصَّابِرِينَ فِي الْبَأْسَاءِ وَالضَّرَّاءِ وَحِينَ الْبَأْسِ أُولَئِكَ الَّذِينَ صَدَقُوا وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ )) (البقره ١٧٧) و هەروەها دەفەرموویێت: ((وَإِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا تَعْضُلُوهُنَّ أَنْ يَنْكِحْنَ أَزْوَاجَهُنَّ إِذَا تَرَاضَوْا بَيْنَهُمْ بِالْمَعْرُوفِ ذَلِكَ يُوعَظُ بِهِ مَنْ كَانَ مِنْكُمْ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ذَلِكُمْ أَزْكَى لَكُمْ وَأَطْهَرُ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنْتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ))(البقره ٢٣٢).

٢ ـ باسکردنی لەزۆربەی سورەتەکانی قورئان بەشێوازی جۆراوجۆر و زۆر بەدوور و درێژی کە باسی هیچ بابەتێکی دیکە وا نەهاتووە.

٣ ـ زۆری ژمارەی ئەو ناوانەی کە خودا لێی ناوە، کە هەر ناوێك گوزارشت لە گەورەیی رووداوەکانی دەکەن. لەم ناوانەش :

( القيامة، الساعة، الآخرة، يوم الدين، الآزفة، الصاخة، الحاقة، والواقعة) وچەندین ناوی دیکە، و گرنگترینیان ( القيامة) یە، چونکە لەم رۆژەدا هەموو مردووەکان زیندوو دەبنەوە، بۆلێپرسینەوە وپاداشت و سزادانیان .

## له نیشانەکانی  ڕۆژی دوایی:

موسلمانان باوەڕیان وایە کە چەند نیشانەیەك دەردەکەون پێش هاتنی ڕۆژی دوایی، بەپێی چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەر(د.خ) لەم نیشانانەش:

١ ـ کات بە دەستەوەنەمان ( ساڵ وەك مانگی لێ دێت، مانگ وەك هەفتەی لێ دێت و هەفتە وەك ڕۆژ و ڕۆژ  وەك کات ژمێرێك).

٢ - زۆر بوونی مردنی کوت وپڕ ولەناکاو و زۆربوونی هۆیەکانی.

٣- دەرچوونی منداڵ  لەفەرمانی دایك و بابی و نەمانی پەیوەندی خزمایەتی.

٤- زۆر بوونی گەواهی دانی بەدرۆ (شهادة الزور)، و شاردنەوەی ڕاستی.

٥- ژن منداڵەکانی دەبنە گەورە و فەرماندەر بەسەریەوە واتا منداڵ دایکی خۆی بە خزمەتکاری خۆی دەزانێت.

ڕۆژی دوایی ڕۆژی لێپرسینەوەیە، خەڵکی لەسەرکاری دونیا پاداشت وسزاد دەدرێن،  تەنها چاکەش لە دونیا سوودیان پێ دەبەخشێت کە بەپێی فەرمانی خودا وپێغەمبەربێت(د.خ) ، بچووکترین وگەورەترین کاریش لێپرسینەوەی لەسەرە، وەك خودای گەورە دەفەرمووێت: (( فَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ )) (الزلزلة ٧).

بۆیە دەبێت موسڵمان گوێرایەلی فەرمانەکانی خودا وپێغەمبەر(د.خ) بێت، بۆ بەدەستهێنانی باشترین پاداشت لەرۆژی دوایی کە بەهەشت وخودا بەڵێنی بە بەندە باشەکانی خۆی داوە بەو بەهەشتە پاداشتیان بداتەوە.

## گفتوگۆ:

١- مەبەست لە رۆژی دوایی لە روانگەی ئاینی ئیسلامەوە چییە؟

٢- هەندێك ئایەت بنووسە دەربارەی رۆژی دوایی جگە لەوانەی کە لەوانەکە دا هاتوون.

٣- مەبەست لە (شهادة الزور) چییە؟

٤- هەندێك لەنیشانەکانی رۆژی دوایی بنووسە.



## وانەی چوارەم

# قەزاو قەدەر

باوەڕهێنـان بـە قـەزاو قـەدەر گرنگییـەکی گـەورەی هەیـە لـەنێو بنچینەکانی بـاوەڕدا، ئـەو کەسانەش دەرکی پـێ دەکەن کـە شـارەزایی کەمیشیـان هـەبێت لـە ئاینی پیرۆزی ئیسلام و بنچینەکانی بـاوەڕدا، لەبەر ئەوەیـە کـە لـە فـەرمودەکانی پێغەمـەردا(د.خ) پێویستی بـاوەڕ هێنان بەقەزاو قەدەر بە چاك و خراپیەوە بەدەق هـاتووە. و گرنگی ئەم بنەمایـە لـە نێوەند تەواوی بنەماکانی دیکە دا بۆ ئەم کاریگەریانەی خوارەوە هاتووە.

**یەکەم-** پەیوەستی یەکسەری بە باوەڕەوە بەوەی کە بینایە لەسەر زانستی راست و دروست بەزاتی خـودای مـەزن و نـاو و سیفەتە پیرۆزەکـانی و لەسیفەتەکانی خـودای گـەورە راستی قـەدەر هـاتووە وەك سـیفەتی (زانـین) و (ویسـت) و (توانـا) و (دروسـتکردنی بونـەوەرەکان) وەئاشکرایە (قەدەر) پەیوەستە بەم سیفەتانەوە.

**دووەم-** کاتێك تەماشایی گەردوون دەکەین لـە چۆنیەتی درووست بوونی و هاتنـەدنیایی بوونەوەرەکان و جێگیر بوونیان لە ناوی دا. و مرۆڤ وەك یەکێك لەو بونەوەرانەیە کە قەدەر جێگری کردوون.

**سێیەم-** بـاوەڕ هێنـان بەقـەدەر سـەنگی مەحەکـە بـۆ مـەودای باوەڕهێنـانی مـرۆڤ بـەخودا لـەڕووە راستەقینەکەوە وەبەرزترین پلـەی تاقیکردنـەوەی مـرۆڤ بـۆ مـەودای باوەڕەکـەی و ئەوەی دادەمەزرێ لەتوێی دڵیدا بەباوەڕی تەواو بەسیفەتەکانی خودای گەورە.

### باوەڕ بەقەدەر ئەم چوار پلەیە دەگرێتەوە:

١- باوەڕ بە زانیاری خودای گەورە بەشتەکان.

٢- بـاوەڕ بوون بـەوەی ئـەو زانیاریانـە بـە گـەورەو بچووکیانەوە لـە(لوح المحفوظ) دا تۆمـار کراون.

٣- باوەڕ بە ویست و دەسەڵاتی خودای گەورە لەبەدی هاتنی هەموو شتەکاندا.

٤- بـاوەڕ بـوون بـە درووسـتکردن و هێنانـە دونیـای هـەموو بوونـەوەرەکان لەلایـەن زاتـی خوداوە، چونکە ئـەو تـەنها درووسـت کـەر و بـەدی هێنـەرە و جگـە لـە زاتـی ئـەو هـەموو بوونەوەرەکانی دیکە درووست کراون.

## کاریگەریەکانی باوەر بە قەدەر:

**قەدەر کاریگەری گەورەی هەیە بەسەر تاك و کۆمەڵەوە کە بەم شێوەیە کورتی دەکەینەوە:**

١- قەدەر لەهەرە گەورەترین هۆکارە کە مرۆڤ بانگ دەکات بۆ کاری چالاك و هەوڵی زۆر بۆ ئەو شتانەی کە خودای گەورە پێی رازییە لەژیان دا، و باوەڕ بوون بەقەدەر بەهێزترین هاندەرە بۆ بڕوادار بۆ ئەوەی کاری چاك و گەورە ئەنجام بدات بەخۆڕاگری و دڵنیاییەوە.

٢- یەکێکی دیکە لە کاریگەریەکانی باوەڕ بە قەدەر ئەوەیە کە مرۆڤ کێشی خۆی بزانێ و خۆبەزل و گێل نەزانێت و خۆ بەگەورە پیشان نەدات. لەبەر ئەوەی ئەو نازانێت چی بۆ نووسراوە و دوا رۆژی رووداوەکان نازانێت دوای ئەوە دان بەبێ توانایی و پێویستی بەخودای خۆی بنێ کە ئەمەش لە نهێنیەکانی شتە نووسراوەکانە.

٣- کاریگەریەکی دیکە ئەوەیە کە مرۆڤ دڵە ڕاوکێ و بێزاری لە ناخی خۆی لابدات لەکاتی روودانی کارێك یان تووش بوون بەکارەساتێك. لەبەر ئەوە ئەو رووداوە پەیوەستە بە قەزای خودای گەورە ئەو خودایەی کە ئەوەی لە زەوی و ئاسمانەکاندا هەیە موڵکی خۆیەتی و ئەبێ ئارام گربێت و چاوەڕوانی پاداشت بکات و بۆ ئەمەیە کە خودای گەورە دەفەرموێت : ((مَا أَصَابَ مِنْ مُصِيبَةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي أَنْفُسِكُمْ إِلَّا فِي كِتَابٍ مِنْ قَبْلِ أَنْ نَبْرَأَهَا إِنَّ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ ﴿٢٢﴾ لِكَيْ لَا تَأْسَوْا عَلَى مَا فَاتَكُمْ وَلَا تَفْرَحُوا بِمَا آتَاكُمْ وَاللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ ﴿٢٣﴾))(الحديد)

٤- باوەڕ بوون بەقەدەر هەموو ئەو نەخۆشییە دەروونییانە لەناو دەبات کە دەبنە هۆی چاندنی رق و کینە و دڵ رەقی لە نێو بڕواداراندا. وەك نموونەی(ئیرەیی –حسد).

چونکە بڕوادار چاو نابڕێتە ئەو شتانەی کە خودای گەورە بەخشیویەتی بە بەندەکانی، چونکە تەنها ئەو دابەش کەری رۆزییە بەسەر ئەواندا و بەڵگەشی بۆ دیاریکردوون. وئەزانێت کاتێك چاو ببڕێتە ئەوان ئەوا رێگرە بەرامبەر بەخششەکانی خودا، بەڵام باوەڕدار هەوڵی کاری چاك دەدات و خەڵکی دیکەی خۆش دەوێ و حەز دەکات ئەوەی ئەو هەیەتی برا موسڵمانەکانیش هەیانبێت، ئەگەر گەیشت بە ئاواتەکانی ستایشی خودای گەورەی لەسەر دەکات، و ئەگەر نەگەیشت بە ئاواتەکانی ئارامگر دەبێت و هەڵناگەڕێتەوە چونکە خودای گەورە خۆی رۆزی دەرەو دابەش کەرە.

٥- باوەڕ بوون بە قەدەر ئازایەتی لە دڵی باوەڕداراندا ئەچێنێت ، کە بتوانێت بەرەنگاری ناخۆشیەکان ببێتەوە. و هێزی خۆڕاگری و فیداکاری بۆ درووست دەبێت لە گۆڕەپانی

جەنگدا و لە مردن ناترسێت. چونکە دڵنیایە کە تەمەن براوەیە و دیاری کراوە و کەس نە دەتوانێت پاش یان پێشی بخات تەنها بۆ ساتێکیش بێت.

٦- باوەڕ بوون بە قەدەر گەورەترین هۆکارە بۆ ڕاسترەوی موسڵمانان بە تایبەتی لە هەڵس و کەوتی لەگەڵ خەڵکانی دیکە. کاتێك یەکێك کەمتەرخەم دەبێت بەرامبەری یان وەڵامی چاکەکانی بە خراپە دەداتەوە. یان تانەی گەورەی لێ دەدات دەبینین بڕوا دارەکە بەخشندەیە بەرامبەری و هەر بە زویی لێی دەبووری. چونکە ئەزانێت ئەو کارانە هەموو دیاریکراون. ئەمە ئەگەر کارەکە بەرامبەر بڕوادارەکە خۆی کرابوو.

بەڵام ئەگەر بەرامبەر خودا کرابوو بەخشندەیی لەو کاتەدا درووست نییە نابێت هیچ بیانویەکی بۆ بهێنینەوە.

٧- باوەڕ بوون بە قەدەر راستی دەرووێنێت لە دڵی باوەڕدارانداو بە تایبەتی راستی باوەڕ چونکە بەردەوام پشت بەستە بە خودا و لە هەموو کارەکانیدا خودای گەورە بە پشتگیر دەزانێت. و بەردەوام پێویستی بەخودا هەیەو داوای یارمەتی هەر لەو دەکات. و بەردەوام بەخشندەیە بەرامبەر خەڵکی و زۆر بە سۆزە بۆیان.

٨- لەکاریگەریەکانی باوەڕ بەقەدەر داواکار بۆ خودا پەرستی داواکەی ئاشکرا دەکات بەرامبەر نەیار و کافرەکاندا و لە خودای گەورە نەبێت لەکەس ناترسێت و راستی باوەڕەکەی بۆ خەڵك روون دەکاتەوە. باسی داواکاریەکانی خودای گەورە دەکات بۆیان و باسی راستی خوداپەرستی و شەریك بۆ خودا پەیداکردن چۆنە. و باسی پوچەڵی و خراپی کافران دەکات و ئاگاداریان دەکاتەوە لە ئەنجامەکانی.

## باوەڕدار و قەدەر:

باوەڕداری راستگۆ مل کەچ ناکات تەنها بۆ خودا نەبێت، و سەری هەر بۆ ئەو نەوی دەکات و لەو دەترسێت. وکاتێك وا دەکات رێگای راست دەگرێت و جێگیر دەبێت لەسەری و داوای بەئەنجامدانی دەکات و ئارامگرە بەرامبەر ئەو ناخۆشی و نەهامەتیانەی لەو رێگەدا یەخەی دەگرێت، لە شەڕی کافران و غەدری زاڵمان فێڵی فێڵبازان هیچ شتێك ناتوانێت بەربەست بێت بۆی، وئەگەر کار وابێت چۆن زەرەیەك لە ترس لە دڵی بڕوادار دا دەمێنێت کە ئەو باوەری وایە ئەوەی هەیەو ئەوەی دێت و ئەوەی دەکرێت و ئەوەی هێشتا نەکراوە هەموو لەژێر فرمان و دەسەلاتی خودای گەورە دایە .

**گفتوگۆ:**

١- کاریگەریەکانی باوەڕ بەقەدەر لەسەر مرۆڤی موسڵمان و کۆمەڵگاکەی چییە؟

٢- ئایا باوەڕ هێنان بە قەدەر کاریگەری لەسەر بڵاوبوونەوەی برایەتی و پێکەوە ژیانەوە هەیە لە کۆمەڵگاکانی مرۆیی دا؟

## وانەی پێنجەم

### چاکەی خودا بەسەر باوەڕدارانەوە

**چاکە:** واتە چاکەی بەرامبەر خەڵکانی دیکە، ئەویش لە رەحمەتی خودای گەورەیە بۆ بەندەکانی لە کاروباری ئاینەکەیانداو لە دونیا دا. چونکە پێدەری چاکە خودای گەورەیە و مرۆڤ وەرگری ئەو چاکەیەیە.

چاکەی خودای گەورە باوەڕدار و بێ باوەڕیش هاوبەشن تیایدا و وەك چاکەی لەش ساغی و خۆراك و سواری و نیشتەجێبوون. و هەموو ئەو بەخششانە پێویستی ستایشن بۆ خودای گەورە.

١- چاکەکان هەمە جۆرن هەندێ جار بۆ سەرجەم باوەڕ داران و هەندێ جار تایبەت بە هەندێکیان وەك روونی دەکەینەوە:

**ئـ- چاکەی خودای گەورە بەسەر موسڵمانان بەگرتنی رێگەی راستی ئیسلام:**

کاتێك خودای گەورە رێی راستی نیشانی موسڵمانان داوە بە بوونە موسڵمانیان چاکەیەکی گەورەی بەرامبەر کردوون چونکە جیاوازی زۆر لەنێوان مرۆڤی باوەڕ دار و مرۆڤی بێ باوەڕ دا هەیە، خودای گەورە دەفەرموێت ﴿...قُلْ لَا تَمُنُّوا عَلَيَّ إِسْلَامَكُمْ بَلِ اللَّهُ يَمُنُّ عَلَيْكُمْ أَنْ هَدَاكُمْ لِلْإِيمَانِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ﴾ (الحجرات١٧).

**ب- چاکەی خودای گەورە بەرامبەر بە باوەڕ داران بە خۆشویستنیان لەلایەن خودای گەورەوە:**

باوەڕ داران مژدە پێدراون بە خۆشەویستی خودای گەورە، باوەڕ هێنان و کردەوە چاکەکانیان پێویستی ئاوڕدانەوەیەکی جوان هەیە لەلایەن خودای گەورە و بەخۆشەویستی بۆیان. خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ سَيَجْعَلُ لَهُمُ الرَّحْمَنُ وُدًّا﴾ (مريم ٩٦).

بەم خۆشەویستییە خودای گەورە چاکە بەخشە بەسەر باوەڕداران دا. کە ئەمە وایان لێ دەکات نزیك بن لە پەروەردگارەوە.

**پ- چاکەی خودای گەورە بە دڵ ئارامبوونی بڕواداران:**

باوەڕدار هەست بە دڵنیایی و ئارامی دەکات لە کاتی رووداو و کارەسات دا. و زۆر جار ئەبینین یان ئەبیستین کە باوەڕداران بە ئارامن لەکاتی مردنی خۆشەویستانیان یان هەر زیانێکی مادیان لێ بکەوێت.

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿...أَلَا بِذِكْرِ اللَّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ﴾ (الرعد٢٨).

بەم دڵنیا بوونە باوەڕ دار خاوەن چاکەیە، وئەم چاکەیە وای لێ دەکات بە ئارام بێت و جێگیر بێت بەرامبەر  بە ناخۆشیەکان.

**ت- چاکەی خودا بەسەر بڕوادارانەوە بە پاکژی دڵەکانیان:**

باوەڕدار دوورە لە ئیرەیی (الحسد) ناوەڕۆکی پاکە سۆزدارە بۆ ئەو هەموو نیعمەت و بەخششانەی کە خودا بەخشیویەتی بە خەڵکی دوعا و نزای زیادبوونیان بۆ دەکات لە بەرامبەریان دەڵێت(ماشاالله) دوای ئەوەی دوعای خێر بۆ خاوەنەکانیان دەکات.

**ج - چاکەی خودای گەورە لە بڵاوکردنەوەی خۆشەویستی و خزمایەتی لە نێوان خەڵکدا :**

خەڵك پێش هاتنی ئاینی پیرۆزی ئیسلام لە بارودۆخی ناهەموار و شەڕەنگێزی دەژیان، کە ئیسلام هات و باوەڕیان پێی هێنا. بارودۆخی ژیانیان گۆڕاو بوون بە برا دوای دوژمنایەتی زۆر. خودای گەورە فەرمویەتی: ﴿...وَاذْكُرُوا نِعْمَتَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنْتُمْ أَعْدَاءً فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُمْ بِنِعْمَتِهِ إِخْوَانًا...﴾ (آل عمران١٠٢).

کە ئەم خۆشەویستییە ئەبێتە هۆی برایەتی و یەك ریزی لەنێوان بڕواداران دا.

**ح- چاکەی خودای گەورە بە پاداشتی دە هێندە یان زیاتر لە بڕی یەك چاکە:**

تەنها ئەو کردەوە چاکەی مرۆڤ دەیکات خودای گەورە بە دەهێندە و زیاتریش پاداشتی دەداتەوە. بەبەڵگەی فەرموودەکەی پێغەمبەر(د.خ) کە دەفەرموێت: **(من جاء بالحسنة فله عشرة امثالها او ازيد)**. ئەم فەرمودەیە باس لە دەهێندە زیاتر دەکات و ئەمەش لە قورئانی پیرۆز دا باس کراوە، خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَثَلُ الَّذِينَ يُنْفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنْبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنْبُلَةٍ مِائَةُ حَبَّةٍ وَاللَّهُ يُضَاعِفُ لِمَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ﴾ (البقرة ٢٦١).

ئەم چاکەیە وای لە بڕواداران کردووە کە کردەوە چاکەکانیان لە زیادبوندا بێت و ببنە براوەی یەکەم.

**خ- چاکەی خودای گەورە بە وەرگرتنی نزای باوەڕداران:**

باوەڕدار مرۆڤە و تووشی گوناه و هۆکاری ناڕەوا دەبێت بەهۆکاری کاری لەبیرچونەوە یان گاڵتە کردن، بەڵام دەرگای پەشیمان بونەوە کراوەیە و خودا بەبەزەییە بەرامبەر بەندەکانی و

لەبەرامبەر پەشیمان بوونەوەی لەگەڵیدا دڵخۆشە بەرامبەر ئەو بەندانەی داوای لێبوردن و پەشیمان بوونەوە دەکەن کاتێك کارێکی خراپ ئەنجام دەدەن.

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِنِّي لَغَفَّارٌ لِمَنْ تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ صَالِحًا ثُمَّ اهْتَدَى﴾ (طه٨٢).

ئەم کردنەوەی دەرگای لێخۆشبونە وای کردووە رێگای گەڕانەوە بۆلای خودای گەورە ئاسان بێت.

**ك- چاکەی خودای گەورە بە ئاسانکاری لە کاروباری ئاینیدا:**

خودای گەورە رێگەی دواخستنی رۆژ و لە مانگی رەمەزاندا و کورت کردنەوەی نوێژەکان لە کاتی نەخۆشی و سەفەر چونکە جێبەجێکردنی ئەم کارانە کاتی دیاریکراوی هەیە لە کاتی سەفەر یان نەخۆشی دا کارێکی گرانە. وەك خودای گەورە دەفەرموێت:

﴿...وَمَنْ كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِنْ أَيَّامٍ أُخَرَ...﴾ (البقرة ١٨٥).

باوەڕدار بەم شێوە چاکەیە ئاسانکاری بۆ دەکرێت بۆ ئەوەی فەرمانەکانی جێبەجێ بکات.

**گ- چاکەی خودای گەورە بەسەرخستنی باوەڕداران بەسەر دوژمندا:**

مێژوو گەواهیدەری گەورەیە لەسەر ئەم پشتگیریەی خودای گەورە بۆ باوەڕداران. و تەنها نموونەیەك وەردەگرین لە شەڕی(بەدر) ی گەورە پێغەمبەر(د.خ) فەرمووی (مژدەبێ ئەبووبەکر سەرکەوتن نزیکە ئەمە جبریلە کە رەشمەی(جڵەو)ی ئەسپەکەی گرتووە بەشدارە) و ئەوەی ئەم پشتگیریە دوپات دەکاتەوە، خودای گەورەیە کەدەفەرموێت: ﴿...وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَكِنَّ اللَّهَ رَمَى...﴾ (الانفال١٧).

**ز- چاکەی خودای گەورە بەسەر ژنانی موسڵمان:**

ژنان لەپێش هاتنی ئاینی پیرۆزی ئیسلام چەوسانەوەی کۆمەڵگا و توندوتیژی یەخەی گرتبون، هەر بە منداڵی زیندە بەچاڵ دەکران،بۆ رزگار بوون لەو سەرشۆڕیەی کە پیاو ئەیخستە باڵ خۆی بەهۆی کچەوە. بەڵام ئاینی پیرۆزی ئیسلام ئەم بۆچوونەی راست کردەوە و وای لە پیاوان کرد کە بەچاوی رێزەوە تەماشای ژنان بکەن، چونکە ژن خێزان و هاورێی تا کۆتایی ژیان و دایکی هەموان و بەهەشت خراوەتە ژێر پێی دایکان وەك رێز لێ گرتن بۆیان. وای لێ هات باوەڕدار بۆچونەکەی راست بووە و دەربارەی ئافرەتان و وای لێ کرد کە بەدادەوە تەماشای ژن بکرێ.

### ٢- چاكەی خودای گەورە تايبەت بە هەندێك لە باوەڕداران:

جار هەبووە خودای گەورە ویستویەتی هەندێك لە باوەڕداران تايبەت بكات بە چاكەيەكەوە وەك:

#### ا- چاكەی خودای گەورە بەسەر پێغەمبەران بە پێغەمبەرايەتی:

كاتێك خودای گەورە مرۆڤێك دەست نيشان دەكات بۆئەوەی ببێتە پێغەمبەر بەم هەڵبژاردنەی ئەم مرۆڤەی پاكڤ كردوەو پلە و پايەی پێغەمبەری پێ بەخشيوە. و ئەم پلەيە چاكەكەی زۆر گەورەيە بۆ ئەم نێردراوە بە تايبەتی، وەك ئەم چاكەيەی كەبەسەر پێغەمبەری ئيسلام محمد(د.خ) بەم ئايەتە: ﴿...وَأَنْزَلَ اللَّهُ عَلَيْكَ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَعَلَّمَكَ مَا لَمْ تَكُنْ تَعْلَمُ وَكَانَ فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكَ عَظِيمًا﴾ (النساء١١٣).

هەروەها خودای گەورە بۆ هەر پێغەمبەرێك موعجزەيەكی پێ بەخشيوە وەك(قورئان) خەڵات و موعجيزەی ئيسلام، وەك زيندو كردنەوەی مردوو لەسەر دەستی پێغەمبەر عيسا (ر.خ).

ب- بە زانست و زانياری وەك (خضری) پياو چاك(ر.خ) وەك خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿...وَعَلَّمْنَاهُ مِنْ لَدُنَّا عِلْمًا﴾ (الكهف٦٥).

ج- چاكەی خودای گەورە بە بەخشينی زانياری پێش وەخت:

كاتێك خودای گەورە كەسێكی خۆش بوێت لە كەسێتی زياد دەكات كاری پێش وەختی پێ دەڵێت. وەك لەگەڵ جێنشين عومەری كوڕی خەتاب(ر.خ) كاتێك لەگەڵ (ساريە) قسەی دەكرد كە لە (نەهاوەند) بوو كە زۆر لێی دوور بوو كاتێك پێی گوت (ساريە) (الجبل - الجبل).

**گفتوگۆ:**

-١

ئ- یەك ئایەت باس بكە بەڵگە بێت لەسەر چاكەی ئیسلام بەسەر بڕواداران.

ب- بەڵگەیەك بڵێ لەسەر خۆشەویستی خودا بۆ بەندەكانی.

پ- بەڵگە بە ئایەتێك بهێنەوە دەربارەی ئاسوودە بوونی دڵی موسڵمانان.

-٢

ئ- مەبەست لە چاكەی خودای گەورە بەسەر باوەڕداران روون بكەوە:

ب- خودای گەورە لە چیرۆكی حەزرەتی ئەیوب دا(ر.خ) دەفەرموێت: ﴿وَأَيُّوبَ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُ أَنِّي مَسَّنِيَ الضُّرُّ وَأَنْتَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ ﴿٨٣﴾ فَاسْتَجَبْنَا لَهُ فَكَشَفْنَا مَا بِهِ مِنْ ضُرٍّ... ﴿٨٤﴾﴾ (الانبیاء).

لەم ئایەتە تێدەگەین كە خودای گەورە چاكەی بەسەر حەزرەتی (ئەیوب) وە هەیە و ئەو چاكەیە چییە؟

٣- خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿...وَمَنْ يُؤْتَ الْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْرًا كَثِيرًا...﴾ (البقرة ٢٦٩).

ئەم چاكەیە چییە كە لەم ئایەتە تێی دەگەیت بینووسە؟

**٤- ئەم بۆشاییانە پڕ بكەوە بە وشەی گونجاو:**

١- ................... موعجیزەیەكە كە خودای گەورە موحەممەدی(د.خ)پێ تایبەتمەند كردوە؟

٢- ................... موعجیزەیەكە كە خودای گەورە تایبەتی كردووە بە پێغەمبەر عیسا(ر.خ)

٣- ................... (زانینی پێش وەخت) كە خودای گەورە (عومەر كوڕی خەتابی) پێ تایبەتمەند كردووە؟

٥- یەكێك لە موعجیزەكان بڵێ كە خودای گەورە تایبەتی كردووە بە پێغەمبەرێك جگە لەوەی لە بابەتی كتێبەكەتدا هەیە.

وانەی شەشەم

## چەند پەندێك لە چیرۆكەكانی قورئان

### ( هاوڕێیانی ئەشكەوت )

**خودای گەورە دەفەرموێت:** (( أَمْ حَسِبْتَ أَنَّ أَصْحَابَ الْكَهْفِ وَالرَّقِيمِ كَانُوا مِنْ آيَاتِنَا عَجَبًا (٩) إِذْ أَوَى الْفِتْيَةُ إِلَى الْكَهْفِ فَقَالُوا رَبَّنَا آتِنَا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَدًا (١٠) فَضَرَبْنَا عَلَى آذَانِهِمْ فِي الْكَهْفِ سِنِينَ عَدَدًا (١١) ثُمَّ بَعَثْنَاهُمْ لِنَعْلَمَ أَيُّ الْحِزْبَيْنِ أَحْصَى لِمَا لَبِثُوا أَمَدًا (١٢) نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ نَبَأَهُمْ بِالْحَقِّ إِنَّهُمْ فِتْيَةٌ آمَنُوا بِرَبِّهِمْ وَزِدْنَاهُمْ هُدًى (١٣) وَرَبَطْنَا عَلَى قُلُوبِهِمْ إِذْ قَامُوا فَقَالُوا رَبُّنَا رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ لَنْ نَدْعُوَ مِنْ دُونِهِ إِلَهًا لَقَدْ قُلْنَا إِذًا شَطَطًا (١٤) هَؤُلَاءِ قَوْمُنَا اتَّخَذُوا مِنْ دُونِهِ آلِهَةً لَوْلَا يَأْتُونَ عَلَيْهِمْ بِسُلْطَانٍ بَيِّنٍ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَى عَلَى اللَّهِ كَذِبًا (١٥) وَإِذِ اعْتَزَلْتُمُوهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ إِلَّا اللَّهَ فَأْوُوا إِلَى الْكَهْفِ يَنْشُرْ لَكُمْ رَبُّكُمْ مِنْ رَحْمَتِهِ وَيُهَيِّئْ لَكُمْ مِنْ أَمْرِكُمْ مِرْفَقًا (١٦) وَتَرَى الشَّمْسَ إِذَا طَلَعَتْ تَزَاوَرُ عَنْ كَهْفِهِمْ ذَاتَ الْيَمِينِ وَإِذَا غَرَبَتْ تَقْرِضُهُمْ ذَاتَ الشِّمَالِ وَهُمْ فِي فَجْوَةٍ مِنْهُ ذَلِكَ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ مَنْ يَهْدِ اللَّهُ فَهُوَ الْمُهْتَدِ وَمَنْ يُضْلِلْ فَلَنْ تَجِدَ لَهُ وَلِيًّا مُرْشِدًا (١٧) وَتَحْسَبُهُمْ أَيْقَاظًا وَهُمْ رُقُودٌ وَنُقَلِّبُهُمْ ذَاتَ الْيَمِينِ وَذَاتَ الشِّمَالِ وَكَلْبُهُمْ بَاسِطٌ ذِرَاعَيْهِ بِالْوَصِيدِ لَوِ اطَّلَعْتَ عَلَيْهِمْ لَوَلَّيْتَ مِنْهُمْ فِرَارًا وَلَمُلِئْتَ مِنْهُمْ رُعْبًا (١٨) وَكَذَلِكَ بَعَثْنَاهُمْ لِيَتَسَاءَلُوا بَيْنَهُمْ قَالَ قَائِلٌ مِنْهُمْ كَمْ لَبِثْتُمْ قَالُوا لَبِثْنَا يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ قَالُوا رَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا لَبِثْتُمْ فَابْعَثُوا أَحَدَكُمْ بِوَرِقِكُمْ هَذِهِ إِلَى الْمَدِينَةِ فَلْيَنْظُرْ أَيُّهَا أَزْكَى طَعَامًا فَلْيَأْتِكُمْ بِرِزْقٍ مِنْهُ وَلْيَتَلَطَّفْ وَلَا يُشْعِرَنَّ بِكُمْ أَحَدًا (١٩) إِنَّهُمْ إِنْ يَظْهَرُوا عَلَيْكُمْ يَرْجُمُوكُمْ أَوْ يُعِيدُوكُمْ فِي مِلَّتِهِمْ وَلَنْ تُفْلِحُوا إِذًا أَبَدًا (٢٠) وَكَذَلِكَ أَعْثَرْنَا عَلَيْهِمْ لِيَعْلَمُوا أَنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ وَأَنَّ السَّاعَةَ لَا رَيْبَ فِيهَا إِذْ يَتَنَازَعُونَ بَيْنَهُمْ أَمْرَهُمْ فَقَالُوا ابْنُوا عَلَيْهِمْ بُنْيَانًا رَبُّهُمْ أَعْلَمُ بِهِمْ قَالَ الَّذِينَ غَلَبُوا عَلَى أَمْرِهِمْ لَنَتَّخِذَنَّ عَلَيْهِمْ مَسْجِدًا (٢١) سَيَقُولُونَ ثَلَاثَةٌ رَابِعُهُمْ كَلْبُهُمْ وَيَقُولُونَ خَمْسَةٌ سَادِسُهُمْ كَلْبُهُمْ رَجْمًا بِالْغَيْبِ وَيَقُولُونَ سَبْعَةٌ وَثَامِنُهُمْ كَلْبُهُمْ قُلْ رَبِّي أَعْلَمُ بِعِدَّتِهِمْ مَا يَعْلَمُهُمْ إِلَّا قَلِيلٌ فَلَا تُمَارِ فِيهِمْ إِلَّا مِرَاءً ظَاهِرًا وَلَا تَسْتَفْتِ فِيهِمْ مِنْهُمْ أَحَدًا (٢٢) وَلَا تَقُولَنَّ لِشَيْءٍ إِنِّي فَاعِلٌ ذَلِكَ غَدًا (٢٣) إِلَّا أَنْ يَشَاءَ اللَّهُ وَاذْكُرْ رَبَّكَ إِذَا نَسِيتَ وَقُلْ عَسَى أَنْ يَهْدِيَنِ رَبِّي لِأَقْرَبَ مِنْ هَذَا رَشَدًا (٢٤) وَلَبِثُوا فِي كَهْفِهِمْ ثَلَاثَ مِائَةٍ سِنِينَ وَازْدَادُوا تِسْعًا (٢٥) قُلِ اللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا لَبِثُوا لَهُ غَيْبُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ أَبْصِرْ بِهِ وَأَسْمِعْ مَا لَهُمْ مِنْ دُونِهِ مِنْ وَلِيٍّ وَلَا يُشْرِكُ فِي حُكْمِهِ أَحَدًا (٢٦) ))

**لە كات و ساتێكی نەزانراو دا لای ئێمە هەتا ئێستاش كە دێیەكی بێ باوەڕ هەبوون پادشاو خەڵكەكەی تووشی گومڕایی بوبون. وباوەڕدار بوون بەشتی بێ گیان و دەیان پەرستن كە**

نەسوود و نە زیانی پێ نەدەگەیاندن. بەبێ بەڵگە دەیان پەرستن. و ڕازی نەبوون کەس باسی خودا درۆینەکانیان بکات و ئەوەی قسەی پێ وتنایە ئازاریان دەدا.
لەو کۆمەڵگە لەڕێ دەرچووەدا کۆمەڵێك گەنج دەرکەوتن کە دوای ژێریان کەوتن و ڕازی نەبوون بۆ غەیری خودا سەر شۆڕبکەن و مل کەچبن کۆمەڵە گەنج و لاوێك باوەڕیان هێنا بە یەزدان، جێگیر بوون لەسەر باوەڕەکەیان خودای گەورە ڕێگای ڕاستی نیشان دان.
ئەو کۆمەڵە گەنجە نەنێردراو نە پێغەمبەر بوون و ئەو کارەیان نەگرتە ئەستۆ کە پێغەمبەران دەیگرنە ئەستۆ، بەڵام خاوەن باوەڕێکی دامەزراو بوون و بەرەنگاری شەریك بۆ خودا پەیداکەران بوونەوە و داوای بەڵگەی بوونی شتێکی غەیری خودا بهێننەوە، دوای ئەوە بڕیاریان دا کە خۆیان و دێیەکەیان ڕزگار کەن بەڕۆیشتن بۆ شوێنێکی ئارام بۆ ئەوەی خودای گەورە بپەرستن دوور لەچاوی کافران. چونکە دێیەکە خراپە و خەڵکەکەشی گومڕان.



گەنجەکان بڕیاری دەرچونیان دا لە دێیەکەیان و ڕوویان کردە ئەشکەوتێکی چۆڵ بۆ ئەوەی لە شوێنێکی ئارام و دوور لە چاوی خەڵك خودا پەرستی بکەن لەگەڵ سەگەکەیاندا، و هەموو شتێکیان لەدوای خۆیان بەجێهێشت لەماڵی ئارام و خۆش لەناو خێزان و کەس و کار و ژووری گەورە و فراوان، باڵەخانەی گەورەیان گۆڕیەوە بە ئەشکەوتێکی تەسك و تاریك و ناخۆش، ئەمە سەیر نییە بەرامبەر بە کەسانێك باوەڕ بە خودا لێوالێوی دڵیان بووە، چونکە باوەڕدار دەشتی چۆڵ بەبەهەشت و ئەشکەوتی تاریك بە کۆشکی گەورە ناگۆڕێتەوە ئەگەر هەست بکات خودای گەورە لەگەڵیدایە.

ئەم گەنجانە منداڵەکانیان بەجێ نەهێشت لەپێناو دونیایەکی پڕ خۆشی و پارە بەڵکو تەنها مەبەستیان ڕەزامەندی خودای گەورە بوو، وهەر شوێنێك کەتیایدا بتوانن خودا بپەرستن و ڕەزامەندی خودا بەدەست بهێنن لەدێیەکەیان باشتربێت.
گەنجەکان پاڵکەوتن لەناو ئەشکەوتەکەدا بۆ حەوانەوە و سەگەکەشیان لەبەردەمی ئەشکەوتەکە دانا لەسەر چۆك کەوت بۆ پاسەوانی کردنی ئەشکەوتەکە.
لێرەدا موعجیزەی خودای گەورە ڕووی دا بە خەوتنی گەنجەکان بۆ ماوەی (سێ سەد و نۆ ساڵ) و لەماوەی ئەم ساڵە زۆرە دا ، ڕۆژ لەلای ڕاستی ئەشکەوتەکە هەڵدەهات و لەلای چەپیانەوە ئاوا دەبوو و تیشکەکەی ڕاستەوخۆ لێی دەدان چونکە لەکاتی خەوتندا ئەمدیو ئەودیو دەکران بۆ ئەوەی تیشکی خۆر ئازاریان نەدا. و ئەگەر کەسێك چاوی بە ئەوان بکەوتبایە دەترسا چونکە ئەوان خەوتبوون بەڵام لەبەر زۆری ئەمدیو ئەودیو کردنیان وات دەزانی بەخەبەرن.
دوای سێ سەدە خودای گەورە جارێکی دیکە بەخەبەری هێنانەوە، بەڵام ئەوان نەیان دەزانی چەند کاتیان بەسەردا چووە، بەڵام خەوتنی زۆریان پێوە دیار بوو کە پرسیاریان لەیەك دەکرد کە دەبێت چەندیان پێچوبێت هەندێکیان دەیان گوت لەوانەیە ڕۆژێك یان چەند ڕۆژێکیان پێ چوبێت. بەڵام بە زوویی ئەو سەرسامیەیان تێپەڕاند چونکە چەند مانەوەیان گرنگ نیە. گرنگ ئەوەیە بەخەبەر هاتوون پێویستە کارەکانیان ڕێك بخەن ئەو پارەیەی پێ یان بوو ئامادەیان کرد و داوایان لە یەکێکیان کرد کە بە دزییەوە بگەڕێتەوە بۆ شار و خواردنی خۆشیان بۆ بکڕێت، و زۆر بە ئاگاییەوە بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی سەربازانی پادشا دوایان نەکەوێت و زاڵمانی خەڵکی دیکە ئازاریان نەدەن، و لەوانەیە سەرپشکیان بکەن لەنێوان گەڕانەوە و شەریك بۆ خودا پەیدا کردنیان یان بەرد باران بکرێن تا مردن.
پیاوە باوەڕ دارەکە بەرەو دێ کەوتە ڕێ بەڵام وەك جاران نەمابوو، شوێنەکان گۆڕابوون دەمووچاوەکان وەك خۆ نەمابوون. پارە و شتومەکەکان گۆڕابوون و سەرسام بوو بەوەی چۆن لەشەو و ڕۆژێکدا ئەم شتانە ڕوودەدەن. و خەڵکی دێیەکە زۆر گران نەبوو سەرسامیەکەی بخوێننەوە و بزانن کە ئەو پیاوە نەناسراوە لە جلەکانیەوە کە لەبەری دابوو و لەو برە پارەیەی پێی بوو.
چونکە خەڵکی ئەو شارە باوەڕیان هێنا بوو، و پاشا زاڵمەکەیان لەکۆڵ بوبوەوەو، پیاو چاکێك هاتبووە شوێنەکەی و خەڵکەکە زۆر دڵخۆش بوون بەو کۆمەڵە گەنجە بڕوادارە، چونکە ئەوان لە پێشەنگی باوەڕدارانی شارەکە بوون. دێیەکەیان بەجێ هێشتبوو لەپێناو

ئاینەکەیاندا و ئێستا هاتونەتەوە و مافی خەڵکەکەیە کە شاد بن بە گەڕانەوەیان، و چوون بۆ بینینیان و دوای دڵنیا بوون لە موعجیزەکەی خودای گەورە لە زیندووبونەوەی مردوان و دڵنیابوونی خەڵکی دێیەکە لە توانای مراندن و زیندوکردنەوە، کە خودای گەورە بیەوێت بەو شێوەیە. خودای گەورە گیانی ئەو گەنجانەی کێشا، چونکە ئەوە رێگای هەموو کەسێکە. دوای مردنیان خەڵکی دێیەکە بۆچوونی جیاوازیان هەبوو هەندێکیان ئەیانویست کە خانوو لە شوێنەکەیان بکرێت و تاخمێکی دیکەیان بۆچوونی درووست کردنی مزگەوتیان هەبوو، و بۆچوونی دووەم جێبەجێ کرا.

هەتا ئێستاش وردەکاری تایبەت بەوان تەواو نازانین ئایا سەردەمی ئەوان پێش سەردەمی حەزرەتی(عیسا) بووە (ر.خ) یان دوای ئەو بووە؟ ئایا لەخۆیانەوە باوەڕیان هێناوە؟ ئایا ئەوان لە یەکێك لە شارەکانی رۆم دا بوون یان لە فەلەستین بوون؟

یان ئەوان (٣) گەنج بوون و چوارەم سەگەکەیان یان (٤) گەنج بوون پێنجەم سەگەکەیان؟ یان (٥) گەنج بوون و شەشەم سەگەکەیان؟

ئەم کارانە هەمووی نادیارن چونکە خودای گەورە رێگرە لە بەرامبەر بە دواداچوون و لێکۆڵینەوە لەو کارە تایبەتانە بەخۆی، چونکە پەندی عیبرەت لە ژمارەیان دا نیە، بەڵکو پەند لە توانای خودای گەورەیە بە مردن و زیندو کردنەوەیان. و دەبێت ئەوە دوای ئەوە موعجیزەکانی خودای گەورە بگوێزرێنەوە بۆ ئەوەی گەورەیی خودا لەیاد نەکەین.

باس کردنی خودای گەورە بۆ(سەگەکەیان) بەوەی کە دوو دەستی بڵاو کردبوەوە لەبەردەم ئەشکەوتەکە دا راکشابوو. لەوە ئەدوێ کە هاوەڵی پیاو چاکان گەورە و پیرۆزە چونکە ئەو پیرۆزی و گەورەییە سەگەکەشی گرتەوە. چونکە سەگەکەش بەشداری موعجیزەی خەوتنی کرد. و ئەمەش گرنگی هاوڕێیەتی پیاو چاکانە.



**گفتوگۆ:**

١- له‌ چ سوره‌تێكدا باسی هاوڕێیانی ئه‌شكه‌وت كراوه‌؟ په‌ند و ئامۆژگاری له‌م چیرۆكه‌ له‌ قورئانی پیرۆزدا چییه‌؟

٢- ئه‌و سووده‌ چییه‌ كه‌ له‌ هاوڕێیه‌تی پیاوچاكاندا ده‌ستمان ده‌كه‌وێت؟

وانەی حەوتەم

## چەند وێنەیەك لە ژیانی پێغەمبەر (د.خ)

### ١- هاتنە خوارەوەی سروش:

پێغەمبەرمان (د.خ) ئەچو بۆ ئەشکەوتی (حەرا) لە نزیك شاری مەککە و مانگی رەمەزان لەو ئەشکەوتە دا دەمایەوە و خودا پەرستی ئەکرد و بیری ئەکردەوە تا خودای گەورە چەند ئایەتێکی بۆ ناردە خوارەوە کە بوو بەسەرەتاو دەستپێکی سەردەمێکی نویَ لە خودا پەرستی، ئەو رۆژە رۆژی دووشەممەی ٢١ی مانگی رەمەزان بەشەو. کە ئەو کات تەمەنی ٤٠ ساڵ بوو. و چۆنیەتی رووداوەکە ئەوەیە کە حەزرەتی جبریل هات بۆ لای پێغەمبەر(د.خ) لە ئەشکەوتی (حەرا) پێی گوت: ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ ① خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ ② اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ ③﴾ (العلق).

### ٢- شەو رەوکردنی (الاسراء والمعراج):

خودای گەورە ویستی رێز لە پێغەمبەری ئیسلام بگرێت بەشەو رەوکردنی بۆ(الاسراء والمعراج).

(الاسراء) بە واتای چوونی پێغەمبەر(د.خ) بەشە و لە شاری مەککەوە بۆ (مزگەوتی الاقصی) و گەڕانەوەی بەشە و، بەلاٌم (معراج) سەرکەوتنی پێغەمبەر(د.خ) لە (مزگەوتی الاقصی) وە بۆ ئاسمانەکان.خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَى بِعَبْدِهِ لَيْلًا مِنَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ إِلَى الْمَسْجِدِ الْأَقْصَى الَّذِي بَارَكْنَا حَوْلَهُ لِنُرِيَهُ مِنْ آيَاتِنَا إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ﴾ (الاسراء١).

ئەم روداوەش لە ٢٧/رجب بەساڵ و نیوێك: پێش کۆچکردن رویدا. و ئاشکرایە کە پێنج نوێژی موسڵمانان لەو سەفەرەدا بڕیاری لەسەر دراوە. و پێغەمبەر(د.خ) لەسەردانەکەیدا ژمارەیەك لەپێغەمبەرانی بینیوە.

### ٣- پەیمانی( عەقەبەی یەکەم):

کاتێك وەرزی حەج کردن هات لەساڵی ١٢ی پێغەمبەرایەت ١٢ پیاو بوون بە موسڵمان لە خەڵکی شاری (یثرب) و پێغەمبەر یان بینی (د.خ) لەلای (عەقەبە) لە (منا) پەیمانیان لەگەڵدا نویَ کردەوە. و خاڵەکانی پەیماننامەکە ئەم خالاٌنە لەخۆ دەگرێت:

أ- شەریك بۆ خودا پەیدا نەکەن.

ب- زینا نەکەن.

ج- منداڵەکانیان زیندەبەچاڵ نەکەن.

د- تاوانی گەورە و فتنە نەنێنەوە.

هـ- هیچ رێگری چاکە نەبن.

پاداشتیان بەهەشت دەبێت ئەگەر ئەم خاڵانەی کە هاتوە لە پەیماننامەکە دا جێبەجێ بکرێت. دوای کۆتایی هاتنی پەیماننامەکە و وەرزەکە تەواو بوو لە ساڵی ١٣ ی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرمان(د.خ) (موصعەب کوڕی عومەیری) نارد هیچ ماڵێك نەما کە رووناکی ئیسلامی تێنەچوبێت. دوای ئەوەی (موصعەب) گەڕایەوە بۆ مەککە و چاکی و ئامادەیی خەڵکی (**یثرب**)ی بە پێغەمبەر راگەیاند کە ئامادەن بۆ چاکە.

**٤- پەیماننامەی (عەقەبە)ی دووەم:**

کاتێك وەرزی حەجکردن هات لە ساڵی سیانزەی پێغەمبەرایەتی ژمارەیەك موسڵمان هاتن بۆ مەککە و پەیمانیان دا بە پێغەمبەر(د.خ) کە کۆببنەوە لەگەڵیدا بە نهێنییەکی تەواو دوای بەسەرچوونی سێیەکی شەو هەتا ژمارەیان گەیشتەحەفتاوسێ پیاو لە نێوانیان دوو ژن هەبوو.

وەگرنگترین بنەماکانی پەیماننامەکە لە دوو مەرج دا خۆی دەبینیەوە.

أ- کە تەنها خوداپەرستی و شەریك بۆ خودا پەیدا نەکەین.

ب- پارێزەر بن بۆ پێغەمبەر وەك چۆن پارێزەر و رێگرن لە خراپە بکرێ بەرامبەر کەس و کاریان.

دوای ئەوە پێغەمبەر (د.خ) داوای لێ کردن کە دوازدە کەسی بەتوانا هەڵبژێرن بۆ ئەوەی بەرپرسیاریەتی بگرنە ئەستۆ لە جێبەجێکردنی پەیماننامەکە لەناو شارەکەیان.



## گفتوگۆ:

پ١- ١- کەی و لەکوێ(سروش-وەحی) هاتە خوارەوە بۆ پێغەمبەر (د.خ)؟

٢- یەکەم ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز کامە بوو، کەهاتە خوارەوە بۆ پێغەمبەر لە ئەشکەوتی (حراء) ؟

٣- ئایەتێك لە قورئانی پیرۆز بنووسە کە بەڵگە بێت لەسەر (الاسراء والمعراج).

پ٢- نیشانەی راست (✓) بەرامبەر دەستەواژەی راست و نیشانەی هەڵە(X) بەرامبەر هەڵە دابنێ:

١- پێنج نوێژەکان پێش سەفەری(الاسراء والمعراج) فەرز کراون.

٢- لە سەفەری (الاسراء والمعراج) پێغەمبەر(د.خ) ژمارەیەك لە پێغەمبەرانی بینی.

٣- (١٢)پیاو لە خەڵکی شاری (یثرب - مەدینە) لە وەرزی حەجدا لە ساڵی ١٢ی پێغەمبەرایەتی موسڵمان بوون لە پەیمانی عەقەبەی یەکەم دا.

پ٣- رستەی ستوونی یەکەم بگەیەنە رستەی گونجاو لە ستوونی دووەم :

| ستوونی یەکەم | ستوونی دووەم |
|---|---|
| ١- لە پەیماننامەی عەقەبەی یەکەمدا موسڵمانەکان پەیمانیان لەگەڵ پێغەمبەر دووپات کردەوە بەوەی | لە رێگرتن بەرامبەر ئەو شتانەی دێتە رێ پێغەمبەر وەك چۆن رێگرن بەرامبەر ئەو شتانەی دێنە رێی کەس و کاریان. |
| ٢- لە پەیماننامەی عەقەبەی دووەم موسڵمانان پەیمانیان بە پێغەمبەر دا | پێی گوت (إقرأ) |
| ٣- لە ئەشکەوتی (حەرا) کاتێك حەزرەتی جبریل هات بۆ لای پێغەمبەر (د.خ) | کە منداڵەکانیان زیندەبەچاڵ نەکەن |

پ٤- وەڵامی گونجاو لەناو کەوانەکان هەڵبژێرە بۆ ئەم بۆشاییانەی لای خوارەوە :

١- دوای تەواو بوونی پەیماننامەی عەقەبەی یەکەم پێغەمبەر(د.خ) ...................... نارد بۆ فێرکردنی خەڵکی (یثرب) .

**(مصعب کوڕی عمیر ، ئەبوبەکری صدیق)**

٢- دوای تەواو بوونی پەیماننامەی عەقەبەی دووەم پێغەمبەر ................ نەقیبی هەڵبژارد.

**(دوازدە ، پازدە)**

٣- تەمەنی پێغەمبەر (د.خ) کاتێك (سروش)ی بۆ هات ...................... ساڵ بوو.

**(چل ، چل و یەك)**

### وانەی هەشتەم

## عائیشە دایکی باوەڕداران ( ڕەزای خودای لەسەر بێت )

### ژیاننامەکەی:

عائیشە کچی ئەوبوبەکری سدیقە (ر.خ) لە ساڵی چوارەمی پێغەمبەرایەتی دا لە دایك بووە لە ماڵێکی پڕ لە باوەڕ و دانایی دا لەدایك و باوکێکی بەخشندە. گەورە بوو لەسەر ڕەوشتی بەرز . و بوو بە موسڵمان لەسەرەتای دەستپێکردنی بانگەوازی ئیسلام دا. کەهێشتا بەتەمەن منداڵ بوو. و نازناوی (ڕاستگۆیی) لێنراو ناسرا بە (دایکی باوەڕداران).

### هاوسەرگیری لەگەڵ پێغەمبەر دا(د.خ):

پێغەمبەر (د.خ) هاوسەرگیری کرد لەگەڵ عائیشە دا دوای مردنی خێزانی یەکەمی(خدیجە کچی خویلد). و خۆشەویستترین کەس بوو لەلای پێغەمبەر(د.خ) لەبەر ئەوە بو ڕۆژەکانی کۆتایی پێش مردنی کاتێك زۆر نەخۆش بوو لە ژوورەکەی ئەو دەمایەوە.

عائیشە (٨) ساڵ و (٥) مانگ لەگەڵ پێغەمبەر دا(د.خ) ژیانی بەسەر برد.

لە ساڵی (٥٧ کۆچی) کۆچی دوایی کرد کە تەمەنی (٦٦) ساڵ بوو. و لەتەنیشت هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ)  لە بەقیع بەخاك سپێردرا لە شاری مەدینەی پیرۆز.

### کەسایەتی و زانستی عائیشە(ر.خ):

عائیشە(ر.خ) لە باوکیەوە فێری بوو پێش چونە ناو ماڵی پێغەمبەرایەتییەوە هەموو ڕۆشنبیری کۆمەڵگەی ئەو سەردەمەی هەبوو.

لە زانیاریە جۆراو جۆرەکاندا سەرکەوتنی بەدەست هێنا و شارەزایی فراوانی لە کاروباری ئاین و حوکمی شەرعی ئاینی ئیسلام دا هەبوو بەهۆی زیرەکی و بیر تیژیەوە.

هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) کاتێك لەکاروباری ئایندا گومانێکیان هەبوایە بۆ گەیشتن بە ڕاستیەکەی ئەگەڕانەوە بۆ لای عائیشە(ر.خ) و زۆربەی شیکردنەوەی کاروباری ژنان بە تایبەتی ئەگەڕێتەوە بۆ شارەزایی ئەو.

گێڕەوەیەکی ڕاستگۆیی فەرموودەکانی پێغەمبەر بوو. چونکە سەدەها فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ) گێڕاوەتەوە لە کاروباری ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا. و هەروەها ئەوەی پەیوەندی بە ژیانی تایبەتی خۆشیەوە هەبووبێت.

هاوڕێیەتی پێغەمبەری کردووە لە ژمارەیەك لە شەڕەکانی ئیسلام دا دژی کافرەکان.

و لەدوای کۆچی دوایی پێغەمبەر(د.خ) ژیانی خۆی لە خزمەتی ئیسلامدا بەسەر بردووە سەرچاوەیەکی گەورە بووە بۆ راوێژکاری لە کاروباری ئاین دا و لەبارەی شەرع و ژیاندا پرسیاری لێکراوە. و ژیانی بەند بووە بە دڵسۆزی بۆ خودای گەورە.

## پلە و پایەی لای موسڵمانان:

عائیشە(ر.خ) پلە و پایەیەکی بەرز و بەنرخی هەبووە لای موسڵمانان لەبەر ئەم هۆیانەی لای خوارەوە:

١- لەبەر ئەوەی ژنی گەورەی نێردراو موحەمەد(د.خ) بووە و دایکی باوەڕدارانە و راستگۆی کچی راستگۆ بووە.

٢- پێغەمبەر (د.خ) وەسیەتی کردووە بەڕێزگرتنی و هەروەها بە کەس و کارەکەشی هەموویان.

٣- پلە و پایەکی زانستی هەبووە چونکە ئەو زانا و شارەزا و گێڕەوەیەکی گەورە بووە بۆ فەرموودەکانی پێغەمبەر(د.خ)

٤- ژیانی پڕ بووە لە کار کردن و تێکۆشان لەپێناوی بڵاوکردنەوەی ئاینی پیرۆزی ئیسلام و جێبەجێ بوونی دادوەری و یەکسانی.

٥- باشترین و گەورەترین پێشەنگی هەموو موسڵمانان بووە لەبەر ئەوەی کەسایەتییەکی دەگمەنە لە مێژووی ئیسلامدا.

## گفتوگۆ:

پ١-

١- عائیشە(ر.خ) کەی لەدایك بووە ؟ باوکی کێیە؟

٢- نازناوی چییە؟ بەچی ناسراوە؟

٣- کەی پێغەمبەر (د.خ) هاوسەرگیری لەگەڵ عائیشە (ر.خ) کردووە؟ و بەڵگە چییە کە ئەو خۆشەویستترین کەس بووە لای پێغەمبەر؟

٤- باس لە کەسایەتی عائیشە (ر.خ) بکە لەبارەی زانستییەوە.

پ٢- گرنگترین هۆیەکانی خۆشەویستی موسڵمانان بۆ بەڕێز عائیشە(ر.خ) باس بکە.

## وانەی نۆیەم

# وازهێنانی دەمارگیری لە ئیسلام دا

پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی: ((لیسَ مِنّا مَنْ دعا إلى عَصَبيّةٍ، وليسَ مِنّا مَنْ قاتلَ على عصبيّةٍ، وليسَ مِنّا مَنْ ماتَ على عصبيّةٍ)) (رواه أبو داود).

واتە: پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی ((لە ئێمە نیە ئەو کەسەی بانگەوازی دەمارگیری دەکات، لە ئێمە نیە ئەو کەسەی شەڕ لەسەر دەمارگیری بکات، لەئێمە نیە ئەو کەسەی لەرێی دەمارگیری دایە)).

دەمارگیری: وەرگرتنی کارەکان بەتوڕەیی وبەزۆر وقبول نەکردنی بەرامبەرەکەت ئەگەر لەسەر ڕاستیش بێت. پێغەمبەرمان(محمد) (د.خ) لەم فەرموودەیەدا بۆمان روون دەکاتەوە کە ئیسلام ئاینی سۆزو بەزەیی ویەکسانی وراستییە بۆ هەموو خەڵك، ئامانجی سەرەکی چەسپاندن وهاتنەدی بنەمای مرۆڤایەتیە. لەبەر ئەوە ئیسلام تانە لەو کەسانە ئەدا کە بانگەوازی دەمارگیری دەکەن. چونکە داخراوەی وتاك رەوییەو دەبێتە هۆی جیاگیری وشەڕو ئاژاوەو دەست درێژی کردن بەرانبەر خەڵکی تر، چونکە مرۆڤەکان هەموو لەیەك باوك ویەك دایکن. وئاینی ئیسلام داوای کراوەیی وخۆشگوزەرانی ئەکات. خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ...﴾ (الحجرات١٣). ئەم ئایەتە پیرۆزە باس لەیەکبوونی رەگەزو پشتی خەڵك دەکات لەهەموو دنیادا لەبەرئەوە داوامان لێ دەکات هەموو جۆرە دەمارگیری رەگەزو نەتەوەو رێبازو زمان لەناوبەرین وفرمان بەدانایی و دواکەوتەی ژێری وزمانی شیرین بین لەبانگەوازو گفتوگۆکانماندا. خودا دەفەرموێت: ﴿ادْعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُمْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ...﴾ (النحل ١٢٥).



هەروەها داوامان لیٚ دەکات هەڵسوکەوتمان لەگەڵ غەیری موسڵماناندا باش بێت وئازاریان نەدەین چونکە ئاینی ئیسلام بەندە لەسەر ئاشتی ودادوەری ویەکسانی. و پێغەمبەر (د.خ) داوامان لیٚ دەکات بەدەست درێژی نەکردنە سەر (أهل الذمة) یان زوڵم لیٚ کردنیان چونکە بەردەوام ئاینەکەمان داوای لێبوردەیی ئاینی وفکریمان لیٚ دەکات لەرێی رێزگرتنی هەموو ئاین وتایەفەو نەتەوەیەك ورێگەدان بەهەڵسوکەوتی مەراسیم وئازادی بیروراو ئازادی رادەربرین. وبۆهەمووان ژیانی برایەتی وئاشتی رێگە پێدراوە لەهەموو ئان وزەمانێکدا.





### هەڵوێستی ئیسلامی لێبوردە لەخەڵك:

١- ئیسلام ئاینی بەزەیی وبرایەتی وئاشتییە بۆ هەموو خەڵك.

٢- ئاینی ئیسلام تانە لەهەموو دەمارگیریەك دەدات.

٣- ئاینی ئیسلام هانی موسڵمانان دەدات بۆ لێبوردەیی ورێزگرتنی هەموو ئاین وخێڵ ورێبازو تایەفەکانی دیکە. هەروەها ئازادییە سەرەکیەکانی خەڵکانی دیکە.

٤- داوامان لیٚ دەکات بەگرتنی رێگەی ژیری ودانایی لەگفتوگۆو لەناکۆکیەکانماندا.

٥- خراپە نەکردن بەرامبەر خەڵکی ناموسڵمان وئازارنەدانیان وهێرش نەکردنە سەریان.

### گفتوگۆ:

١- بۆچی ئاینی ئیسلام تانە لەدەمارگیری دەگرێت؟ شێوەکانی دەمارگیری باس بکە؟

٢- ژێر دەستە (الذميّ) کێیە و پێغەمبەر (د.خ) چیمان پیٚ دەڵیٚ دەربارەیان؟

٣- هەندێك لەهۆکارەکانی بڵاوبوونەوەی دەمارگیری باس بکە لەکۆمەڵگەدا.

٤- مانای لێبوردەیی روون بکەرەوە.

٥- ئەم بۆشاییانە بە ووشەی گونجاو پڕبکەرەوە.

أ- ئیسلام ئاینی ......... ، ............ ، ............. هەموو خەڵکە.

ب-ئیسلام تانە لەو مرۆڤانە دەگریٚ کەداوای .......... ، ........... دەکەن.

## وانەی دەیەم

# توڕەبون

## زیان وچارەسەر

هەڵسوکەوتی مرۆڤ هەندێك جار لەحاڵەتێكی ئاسودەیی وهەندێك جاریش نائاسودەیی. وئەم حالەتە ناودەبرێ بە(ژیانی ویژدانی) وئەم حاڵەتە ویژدانیە هەندێك بەهۆی كاریگەری جۆراوجۆر دەبێت بەهۆكاری (توڕەبون).

### پێناسەی توڕەبون:

لای زانا دەرونیەكان (دڵە ڕاوكێیەكی زۆرە كەتوشی تاكەكان دەبێت، لەبنەڕەتەوە دەرونیەو هەڵسوكەوتی ئەو تاكە دەگرێتەوە لە بواری هەستكردن بە كارێك ڕوودەدات) چونكە هەڵچوونە توندەكان، وەك پێكەنین یان گریان یان هەڵچونێكی بەهێز كارتێكردنێكە كە هەندێك جار كۆنترۆڵی تەواوی ئەقل وهەست پێكردنی تیا لەدەست دەدات.



### كاریگەریەكانی هەڵچون:

كاریگەریەكانی هەڵچوون لەسەر (لاشەو ئەقڵ وهەڵسوكەوت) بەگشتی دەكەوێت. زانایانی دەرون ناسی جیاوازی لەنێوان گۆڕانكارییە جەستەییە دیارەكان ودەرونییە نادیارەكان دەكەن وەك گۆڕانی ئامێرە پەرچەكردارە جیاوازەكان وچالاكی غوددەو تێكچونی باری دەرونی وزیادبونی پاڵەپەستۆی خوێن. وەك (أبو حامد الغزالي) دەست نیشانی ئەو جیاوازیە دەكات ودەڵێت: (ئەگەر گڕی توڕەبوون توندبوو خاوەنەكەی كوێردەبێت

وهەڵچونی خوێن بەرزدەبێتەوەو خوێن بەرەو سەرەوەی جەستە بەرز دەبێتەوە وەك چۆن ئاوی کوڵاوی ناو مەنجەڵێك بەرزدەبێتەوە ولەدەم وچاوی دا کۆدەبێتەو دەبێتە هۆی سوربونەوەی دەم وچاو).

لەکاریگەری پەرچەکرداری تورەیی لەسەر لاشەی مرۆڤ:

١- گۆڕانی ڕەنگەکان.

٢- لەرزینی زۆری دەستەکان.

٣- تێکچوونی جوڵەو قسەکردن.

## کاریگەریە ئەقلیەکانی تورەیی:

کاریگەری تورەبونی ئاسایی هاوکارە لەچالاکی هەڵسوکەوتی مرۆڤەکان. بەلام کاریگەری تورەبونی زۆر پێچەوانەی بیرکردنەوەی راست وهەڵسوکەوتی چالاکە. ژیرترین مرۆڤ ئەوانەن کەتوڕەییان کەمە. چونکە تورەبونی زۆرو لە رادەبەدەر مرۆڤ لەبیرکردنەوەی ڕاست لائەدات و مرۆڤ هیچ تێروانینێکی راستی نامینێت.

## چارەسەری تورەبوون:

ڕێگای چارەسەرکردنی تورەبون پشت بەستە بەلایەنی فیکری وهەستی مرۆڤەکان بەپشت بەستنی مرۆڤ بەیەکێك لەم کارانە.

١- بیرکردنەوەی مرۆڤ لەو شتانەی کەباس لەپلەوپایەی کپکردنەوەی تورەبون وئارامی وئارەزوکردن بۆ وەرگرتنی پاداشتی زۆر، بەمە تورەبونەکەی کەم دەبێتەوە، خودا دەفەرموێت: ﴿...وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ﴾ (١٣٤ آل عمران).نەفسی خۆی بترسێنی بەسزای خودا.

٢- ئاگاداری خۆبکات لەسەرەنجامی دوژمنایەتی وتۆڵە سەندنەوە.

٣- بیر لەناشیرین بونی روخساری خۆی بکاتەوە لەکاتی تورەبون دا.

٤- بیر لەو هۆکارە بکاتەوە کەئەیگەیەنێت بەئارەزوی تۆڵە سەندنەوە بەمەش لەگرنگیەکەی کەم دەکاتەوە. بەلام پشت بەست بەلایەنە پراکتیکیەکەوە بەگوتارو بەکردار:

ئ-بە (گوتار): کە بەزمانی خۆت بڵێیت (**اعوذ بالله من الشیطان الرجیم**) بەمە دەرونت لەو تورە بوونە رزگاردەکەیت ورێرەوەکەی دەگۆرێت بەرەو بیرکردنەوەی چاك.

ب- یان بەکردار:

١- بەگۆڕینی شێوازی جەستەت (دابنیشە لەکاتی توڕەبوندا ئەگەر بەپێوەبویت)(بەڕاکشانت ئەگەر دانیشتبویت) وەك پێغەمبەر (د.خ) فەرمویەتی **((ان الغضب جمرة توقد في القلب، الم تر انتفاخ اوداجه وحمرة عينيه، فاذا وجد احدكم من ذلك شيئاً فان كان قائماً فليجلس، وان كان جالساً فليقم)).**

زانا دەرون ناسەکان ئەم شێوازەی گۆڕینی جەستەییان باس کردووە. چونکە هەموو هەڵچوونێك ئەبێتە هۆی گۆڕینی شێوازی جەستەکان روکاری دەرەوەو ناوەوەوی وگۆڕینی ئەو شێوازانە دەبنە هۆی دامرکاندنی توڕەییەکە.

٢- یا بەگۆڕینی ناوەوەی جەستەکان (هەناوەکان) مەبەست لەمە هێورکردنەوەی بەشە هەناویەکانی جەستەی مرۆڤ لەکاتی هێرش وتێکچوونی باری ئاسایی خۆیدا. و(غەزالی) بەڵگە بۆئەمە بەفەرمودەکەی پێغەمبەر (د.خ) دەهێنێتەوە کەفەرمویەتی: **((فان لم يزل ذلك فليتوضأ بالماء البارد او يغتسل فان النار لايطفئها الا الماء)).**

واتە: (ئەگەر توڕەبونەکە بەردەوام بوو با دەست نوێژ بگرێت بەئاوێکی سارد یان خۆی بشوات چونکە ئاگری توڕەیی ئاو نەبێت هیچ نایکوژێنێتەوە).

**دەقە پیرۆزەکانی (قورئان) وفەرمودەکانی پێغەمبەر (د.خ) دەربارەی توڕەبون:**

١- خودا فەرمویەتی: **﴿وَالَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَائِرَ الْإِثْمِ وَالْفَوَاحِشَ وَإِذَا مَا غَضِبُوا هُمْ يَغْفِرُونَ﴾** (الشورى٣٧).

چونکە ئەوانەن کە گوناهی گەورەیان نەکردووە وەك هاوبەش بۆ خودا پەیداکردن وگوناهە زۆر گەورەکان ئەگەر توڕەبون ونەبونە هۆی ئازاری خەڵك وتۆڵە سەندنەوە لەبەرامبەرەکانیان بەڵام دانیان بەخۆدا گرتووە لەکاتی توڕەبوندا، چونکە کپکردنەوەی توڕەیی ودان بەخوداگرتن لەهەرە سیفەتە بەرزەکانە کەخاوەنەکەی ئەبێتە پێشەنگی باوەڕداران.

٢- فەرموودەی پیرۆزی پێغەمبەر (د.خ) (عبدالله بن مسعود) دەڵێت پێغەمبەر فەرمووی (د.خ) **((ليس الشديد بالصرعة انَّما الشَّديد من يملك نفسه عند الغضب))** هاوڕابوونی لەسەرە.

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت ئەوەی دان بەخۆیدادەگرێت وئارام دەبێت لەکاتی توڕەبوندا ئەو پاڵەوان وبەهێزە نەك ئەوەی کەزۆرانبازی دەکات وبەرانبەرەکەی ئەدات بەزەوی دا.

## گفتوگۆ

١- ئەمانە تەواو بکە:

ئـــ- لەکاریگەریـــە ئەقلیـــەکان بـــۆ هەڵچـــوون وتورەبـــون ئەوانـــەن ١-...............

٢-................

ب- تورەبونی ئاسایی هاوکارە لە........................

پ - کاریگەری وکاردانەوەی تورەبون لەجەستەدا دەرئەکەوێت لە:

ئـ- ........................، ب- ...............................، پ -. .......................... .

٢- ئەو کارانە چین کەمرۆڤ پشتیان پێ دەبەستێت لەچارەسەرکردنی تورەبوندا.

ئـ- ........................ ب- ........................

پ - ......................... ت- ........................

ج-........................

٣- ئایەتێکی قورئانی پیرۆز بلێ کە لەبەرتکردوە لەبارەی ئەو کەسانەی کەتورەبونیان کپ دەکەنەوە.

٤- فەرمودەیەکی پێغەمبەر (د.خ) بنوسە دەربارەی خۆراگرتن لەکاتی تورەبوندا.

## وانەی پانزەم

### دڵسۆزی لەکارکردندا

پێغەمبەر(د.خ) فەرمویەتی:((إنّ الله عزّ وجلّ يحبُّ إذا عملَ احدكم عملاً انْ يُتقِنَهُ)).تەبەڕانی ریوایەتی کردووە ، واتە پێغەمبەر (د.خ) فەرمویەتی: خودای گەورە ئەو کەسانەی خۆش دەوێت کەکارێکیان کرد بەکارامەیی ودڵسۆزی بیکەن. ئاینی ئیسلام بەڕێزەوە دەروانێتە کارکردن، وهانی موسڵمانەکانی داوە بۆکارکردن وگرنگیەکی زۆری پێداوە. چونکە کارکردن بناغەی شارستانێتی وپێشکەوتنە. وخودای گەورە دەست خۆشی لەو کرێکارانە دەکات کەکاردەکەن لەپێناو خۆیان وخێزانەکانیاندا.

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَقُلِ اعْمَلُوا فَسَيَرَى اللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُ وَالْمُؤْمِنُونَ...﴾ (التوبة١٠٥). چونکە چاکەکردن خوداپەرستییەو زادەی ژیانێکی ئازادو بەرزەو پێویستە لەسەر موسڵمان کەدڵسۆزبێت لەکارەکەیدا لەپێناو خزمەتکردنی کۆمەڵ ونیشتمان. وپێویستە لەسەر موسڵمان ژن یان پیاو ولەهەر شوێنێکدا کاردەکەن وچ پلەو پایەکیان هەبێت کاربکەن بەتواناو چالاکی تەواو لەپێناو بنیاتنانی داهاتویەکی پرشنگدار.

خودا دەفەرموێت: ﴿...فَمَنْ كَانَ يَرْجُو لِقَاءَ رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَالِحًا...﴾ (الكهف١١٠).

پزیشك پێویستە دڵسۆز بێت لەکارەکەیدا بەرامبەر نەخۆشەکانی لەدەست نیشانکردنی نەخۆشی وپێدانی چارەسەرو دیاریکردنی دەرمان.

وئەندازیار پێویستە دڵسۆز بێت لەکاتی سەرپەرشتی کردنی باڵەخانەکاندا لەپێناو ساغ وسەلامەتی هەمواندا و دەرخستنی روکەشێکی بیناسازی جوان.

مامۆستاش پێویستە کارەکانی بەدڵسۆزی ئەنجام بدات لەپێگەیاندنی نەوەیەکی نوێ وپەروەردەکردنی خوێندکارو قوتابیان لەسەر رێبازێکی راست. وکرێکاران بەهەموو جۆرە پیشەکان پێویستە کاربکەن بەهەموو تواناو چالاکی وسستی نەکەن لەئەنجام دانی کارەکانیاندا. هەروەها بۆ هەموو ئەندامانی کۆمەڵ هەرکەس بەپێی کارەکەی.

### مەرجەکانی دڵسۆزی لەکارکردندا:

١- پابەندبوون بەکاتی دیاریکردنی دەوام ونەچونە دەرەوە.

٢- تەواوکردنی هەرکارێك کەپێت سپێردرا بەپێی پێوەرە داواکراوەکان.

٣- ووردبینی لەکارەکانداو هەستکردن بەپەرسیارێتی وپشت گوێ نەخستنی کارەکان.

٤- دەست پاکی وبەرەنگاربونەوەی گەندەڵی ووەرنەگرتنی بەرتیل یان دەستکەوتنی سوود بەرێگای نادروست.

٥- جێبەجێکردنی بنەمای دادوەری ویەکسانی لەنێوان ئەندامانی کۆمەڵدا.

## گفتوگۆ

١- بۆچونی ئیسلام بەرامبەر کارکردن چیە؟

٢- بەڵگە بەئایەتێکی قورئان بهێنەرەوە باس لەگرنگی وراستگۆیی لەکارەکاندا بکات.

٣- گرنگترین مەرجەکانی دڵسۆزی لەکارکردن دا چین؟

٤- قوتابی چۆن ئەبێت دڵسۆز بێت لەکارەکەیدا؟

٥- هەندێك لەو سەرپێچیانە دەستنیشان بکە کە هەندێك لەکارمەندانی دەزگاکانی حکومەت پێی هەڵدەستن.



### وانەی دوانزەم

## سوێندو حوکمەکانی

**پێناسەکەی:** سوێند خواردن لەسەر شتێك رووی داوە.

ئەوەی دروستە لەسوێن خواردن وئەوەی نادروستە.

١- دروستە سوێند خواردن:

ئ- بەناوەکانی خودا وەك: (بەخودا)

ب- بەسیفەتەکانی خودا وەك: (سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە) یان (بەگەورەیی خودا).

پ- بەقورئانی پیرۆز(چونکە قورئان گوتاری خودایەو سیفەتێکە لەسیفەتەکانی).

٢- دروست نیە سوێند خواردن.

بەهەر دروستکراوێك پێغەمبەر(د.خ) بێت یان پیاوچاك بێت یان سەرکردەبێت.

٣- دروست نیە سوێندخواردن بە **(کعبة)** یان هەرماڵێك لەماڵەکانی خودا یان نیعمەتێك لەنیعمەتەکانی.

پشت بەست بەفەرموودەی پێغەمبەر(د.خ) ((**من کان حالفاً، فلیحلف بالله أو لیصمت**)).

**واتە:** ئەوەی سوێند خۆرە، سوێند بەخودا بخوات یان بێدەنگ بێت.

### جۆرەکانی سوێند:

١-سوێندی سەر زمان (**اللغو**) ئەو سوێندەی کە بەسەر زمانی موسڵماندا دێت بێ هیچ مەبەستێك لەکاتی قسەکردندا وەك گوتنی (نەبەخوا) یان (بەڵێ بەخوا) ئەو جۆرە سوێندە هیچ جۆرە گوناه و بەخشینێکی نیە بەبەڵگەی خودا دەفەرموی﴿لَا يُؤَاخِذُكُمُ اللَّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ...﴾ (المائدة ٨٩).

٢- سوێندی درۆ: ئەم جۆرەش سوێند خواردنە بەدرۆ لەسەر شتێك کەدرۆ دەکات خاوەنەکەی رووی نەداوە. وئەم جۆرە سوێندخواردنە لای دووروەکان زۆرە یان ئەوانەی کریارو فرۆشیارن بۆئەوەی بازاڕیان گەرم بێت وپارەیان دەست بکەوێت.

وناونراوە بە(نوقم بون) چونکە خاوەنەکەی نوقمی تاوان دەکات وپێویستە لەسەر سوێند خۆری درۆ تۆبە بکات پەشیمان بێتەوەو داوای لێبوردن بکات. وپێویستە لەسەری باجی سوێندەکەی بدات. ﴿...وَلَكِنْ يُؤَاخِذُكُمْ بِمَا عَقَّدْتُمُ الْأَيْمَانَ..﴾ (المائدة ٨٩).

٣- سوێندی پەیوەست: ئەو سوێندەیە کە لەسەر کارێك ئەخورێت کەببێت یان نەبێت لەداهاتودا وەك موسڵمانێك بلێت (بەخودا ئەو کارە ئەکەم) یان (ئەو کارە ناکەم). وحوکمەکەی ئەوە یە کە سوێندی لەسەر هەرشتێك خواردو نەیکرد پێویستە بەخشینەکەی بدات.

## بەخشینەی سوێند خواردن:

پێویستە ریزبەندی وهەڵبژاردەی تیا بکرێت:

ناندانی (دە) هەژار، یان پۆشاکیان، ئەگەر نەیتوانی(٣) رۆژ بەرۆژو بێت.

## سوێندخواردن لەمامەڵەکردندا:

خودای گەورە رێگەی بەکڕین وفرۆشتنی حەڵاڵ داوە بۆ بەندەکانی بۆپاراستنی بەرژەوەندیە دنیاییەکانیان لەبەرئەوە پێویستە لەسەر موسڵمان کە شارەزابێت بەکاروباری کڕین وفرۆشتنەوە وئەوەی رودەدات لەکاری سوێند خواردن کە رۆژانە لەسەر زمانی خەڵك ئەیبینین زۆرێك لەخەڵك سوێند بۆ سادەترین شت دەخۆن هەتا وای لێهاتووە سوێند خواردن بووە بەنەریتێك. وازهێنان لەو نەریتە پارێزگاری کردنە لەرێگە پێنەدراوەکان وبەرزراگرتنی ناوو سیفەتەکانی خودای گەورەیە.

## بۆچونی ئاینی ئیسلام دەربارەی سوێند خواردن:

سوێند خواردن لەبنەڕەتدا رێگە پێدراوە، هەندێك جار دروستەو هەندێك جاریش رێگری لێکراوە، چونکە زۆری سوێند خواردن ئەبێتە هۆی شکاندنی سوێند بەواتای (جێبەجێنەکردنی کاری سوێند خواردنەکە) ودەربارەی ئەمە پێغەمبەر (د.خ) فەرمویەتی ((**إياكم وكثرة الحلف في البيع، فانّه ينفق ثم يمحق**)).

## هاندەرەکانی سوێند خواردن:

١- بۆ بازاڕ گەرم کردن و هاندانی خەڵك بۆکڕین.

٢- بەهۆی بێ متمانەیی لەبەر ئەوەی کەسێك باوەڕی بەخۆی هەبێت پەنا بۆسوێند خواردن نابات.

٣- نەبونی دەستپاکی لای سوێند خۆرەکە.

### سەرەنجامی سوێندخواردن وزیانەکانی:

١- لەپێشدا فرۆشتن زیاد دەکات چاوی خەڵك بەردەگرێت، لەسەرەتاوە بەشێوەیەکی کاتی کڕیار زۆردەبن وقازانج زۆر دەکات.

٢- ئەم کارە بەردەوام نابێت چونکە خودای گەورە ئەو قازانجە زۆرە لەناودەبات خاوەنی سوێندەکە بەدەست بەتاڵی دەمێنێتەوە لەئێستادا بێت یان لەداهاتوودا.

٣- کردنی گوناهی زۆر لەلایەن سوێند خۆرەوە بەهۆی زۆری شکاندنی سوێندەکان.

٤- ئاگری ڕۆژی دوایی پاداشتی سوێند خۆری بەدرۆیە کەزیان بەخەڵك دەگەیەنێت ودەست بەسەر سەروەت وسامانەکانیاندا دەگرێت. پێغەمبەر(د.خ) فەرمویّ: ((**من اقتطع حق امرئ مسلم بيمينه فقد اوجب الله له النار وحرم عليه الجنة**)).

### لەڕەوشتەکانی فرۆشیاری باوەڕدار لەمامەڵەدا:

١- ڕاستگۆیی: فرۆشیار پێویستە ڕاستگۆ بێت لەوەی ئەیلێت سەبارەت بەجۆرو نرخی شمەکەکانیەوە. پێغەمبەر(د.خ) فەرموی: ((**البيّعان بالخيار مالم يتفرَّقا، فان صدقا وبينا، بورك لهما في بيعهما، وإن كذَّبا وكتما مُحقت بركة بيعهما**)).

٢- پێشخستنی بەرژەوەندی کڕیار لەلایەن فرۆشیارەوە. پێغەمبەر(د.خ) فەرمویّ:((**زِنْ ورَجِّحْ**)).

٣- پشت نەبستن بەسوێندخواردن.

٤- دورکەوتنەوە لەساختەکاری ودەرخستنی شمەکەکان ونەشاردنەوەی خراپەکانی.

٥- بەکارهێنانی تەرازووی دروست. خودا دەفەرموێت: ﴿...وَزِنُوا بِالْقِسْطَاسِ الْمُسْتَقِيمِ...﴾ (الاسراء٣٥).

### لەڕوداوە گزی کردنە بەناوبانگەکان:

لە پێغەمبەر(د.خ) گێڕدراوەتەوە: (**مَرّ على كومة طعام فادخل يدخله فيها فنالت أصابعه بللاً فقال ماهذا يا صاحب الطعام. فقال أصابته السماء يارسول الله(ص). قال: ((افلا جعلته فوق الطعام كي يراه الناس مَنْ غَشَّ فليس مني))**).

واتە: پێغەمبەر(د.خ): بەلای خەرمانێك دا تێپەربوو دەستی خستە ناو خواردنەکەوە دەستی تەڕبوو فەرموی ئەی خاوەن خواردەمەنی ئەوە چییە؟

لەوەڵامدانەوەی گوتی ئەوە باران تەڕی کردووە خراپ بووە. پێغەمبەر(د.خ) فەرموی: ئەکرێت ئەو خراپ بووە بخەیتە سەرەوە هەتا خەڵك ببینن گوتی: (ئەوەی ساختە بکات لەمن نیە).

## گفتوگۆ

١- مانای سوێند چیە؟

٢- سوێندخواردن تەنها بەناوو سیفەتە جوانەکانی خودا دەبێت، روونی بکەرەوە؟

٣- بەراست یان بەهەڵە وەڵامی ئەمانە بدەرەوە؟

ئ-دروستە سوێندخواردن بەپێغەمبەر(د.خ).

ب- دروست نیە سوێندخواردن بە پیاوچاکان.

پ - دروست نیە سوێند خواردن بە کەسەکان.

ت- دروستە سوێند خواردن (بەکەعبەی پیرۆز).

ج- دروستە سوێند خواردن بە قورئان.

٤- مەبەست لەسوێندی سەرزمان (اللغو) چییە؟ و ئایا موسڵمان لێپرسینەوەی لێ دەکرێت لەبەرامبەری دا.

٥- مەبەست لەسوێندی بەدرۆ چییە؟ بۆ ناو براوە بەدرۆ؟

٦- چی پێویستە لەسەر کەسێك سوێندی بەخودا بەدرۆ خواردبێت.

٧- ئەم بۆشاییانە تەواو بکە:

ئ- ............... سوێند خواردنە لەسەر شتێك بکرێت یان نەکرێت لەدوا رۆژدا.

ب- پێغەمبەر(د.خ) دەفەرموێت: (**من كان حالفاً فليحلف**.......).

پ- بەخشینەی سوێند پێدانی خۆراکی .................. یان .................. یان بەرۆژوو بوون بۆ ماوەی.................... .

٨- وەڵامی راست لەنێوان کەوانەکاندا هەڵبژێرە:

ئ- سوێندی پەیوەست هەڵقولاوە لە.................... (زمان،دڵە)وە.

ب- سوێندی درۆ (الغموس) ئەو سوێندەیە کەمافی خەڵکی تیادا .................... (ئەچەسپێ، ئەفەوتێ).

## چالاکی

١- فەرمودەیەك بڵێ دەربارەی ئاگادارکردنەوەی باوەڕداران لەزۆری سوێند خواردن.

٢- بەڵگەی فەرمودەیەکی پێغەمبەر(د.خ) بهێنەرەوە کەتیایدا دوپاتی سزای ئاگر دەکاتەوە بۆ ئەوانەی سوێند بەدرۆ دەخۆن بۆ دەست بەسەرداگرتنی پارچەیەك زەوی.

## وانەی سیانزەم

### (ئیرەیی ـ حەسودی)

ئیرەیی (**حەسـودی**) نەخۆشـیەکی دەرونیـە بـەزۆری کـەمێك لەخـەڵك ئـەتوانن خـۆی لێ رزگاربکەن، ئەوانیش باوەڕدارە راستەقینەکانن لەبەرئەوە گوتراوە: (هیچ لاشـەیەك بەدەرنیـە لەحەسودی، پیاوی خراپ ئاشکرای دەکات وپیاوچاکان دەیشارنەوە).

(ئیرەیی ـ حەسودی) دووجۆرە:

١- ئیرەیی ـ حەسودی راستەقینە(نـەفرەت لێکـراوە): ئەوەیـە کـە مـرۆڤ حـەز بکـات ئەوەی هاورێیەکەی هەیەتی لەناوچێت.

٢- ئیرەیی ـ حەسودی (بەچاکە): ئەوەیـە کـەمرۆڤێك حـەز بکـات ئـەوەی هاورێیەکـەی هەیەتی ئەویش هەی بێت بەبێ ئەوەی حەز بە لەناوچونی ئەوی دیکە بکات.

ئ - ئەگەر بۆ سەروەتێکی دنیایی بێت دروست نیە.

ب-ئەگەر بۆ خودا پەرستی بێت دروستە.

وەك لەفەرمودەیەکی پێغەمبەر(د.خ) هاتووە ئەفـەرموێت: ئیرەیـی تـەنها لـەدوو شـتدا رێگـەی پێدراوە یەکەم پیاوێك خودا سامانێکی پێداوە لـەرێی چاکەدا خـەرجی بکـات، یـان پیاوێك خودا زانستێکی داوەتێ خەڵکی فێربکات.

پێغەمبەر(د.خ) دەفەرموێت: ((لاحسد الا في اثنتين رجل آتاه الله مالاً فسلطه على هلكته في الحق، ورجل اتاه الله الحكمة فهو يقضي بها ويعلمها))متفق عليه.

ئەم جۆرە ئیرەییە باشـە، لەبەرئـەوەی مرۆڤـی موسـلمان حـەز لەچاولێکردنی چاکە دەکـات وئەیـەوێت بەشـداربێت لەگـەڵ چاکەکەراندا، پێشـبرکێ بکـات لـەداوای نیعمەتـدا بۆئـەوەی بەردەوام بێت.

بۆ رێگەگرتن لە(ئیرەیـی) لـە(ئەنـەس کـوری مالیـك)ەوە هـاتووە. پێغەمبـەر(د.خ) دەفـەرموێت: (رقتان لەیەك نەبێت وچاوپیسی مەکەن پشت لەیەك مەکن، بن بەبەندەی خوداو برابن لەگەڵ یەکدی)(صحيح البخاري).

((لاتباغضوا ولاتحاسدوا ولاتدابرو وكونوا عبادَ الله اخواناً)). (صحيح البخاري).

پێغەمبـەر(د.خ) دەفـەرموێت: (إياكم والحسـد فإن الحسـد تأكل الحسـنات كما تأكل النـار الحطب) متفق عليه.

## هۆكاری زۆربونی ئیرەیی:

ئیرەیی لەدڵی خاوەنەكەیدا هەندێك جار زیادو هەندێك جار كەم دەكات وهەندێك جار دادەپۆشرێت وهەندێك جار كلپە دەكات لەبەر ئەم هۆكارانە:

١- نزیك بونەوەوتێكەڵبوون: لەنزیكبونەوەی خێزانی ولەكاری پیشەیی دا یان لە موچەو یان لە پلەو پایەی رێكخراوەی دا.

٢- پتەوبونی زۆرەملیێ وزیادەڕۆیی بەسەر خەڵكدا: هەركاتێك ئیرەیی زۆر بێت دەسەڵاتداران زوڵم وزۆریان زیاددەكات.

٣- بەهێزبونی رەزیلی و دەستگرتن بەسامانەوە.

## دەرمانی لەناوبردنی ئیرەیی لەخودی خۆیدا:

١- كورت دەكرێتەوە لە(زانست وباوەڕدا). چونكە ئیرەیی زیانی هەیە بۆ خودی حەسودەكە لەم دنیاو لەو دنیاش دا، ئەگەر هاتوو زانست و باوەڕی هەبوو بە راستی پەیمانەكانی خودا ئەوا واز لە ئیرەیی ئەهێنێت ئەبێتە داواكاری خێروچاكە بۆ برای موسڵمانی.

٢- پشت بەستن بەخودای گەورەو گوتنی:(**حسبنا اللهُ ونعم الوكيل**) لەبەرئەوەی خودای گەورە فەرمویەتی ﴿...وَمَنْ يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ...﴾ (الطلاق٣).

٣- خودا پەرستی خودای گەورە: (چونكە ئارام گرتن وخودا پەرستی مرۆڤ دووردەخەنەوە لەفێڵی فێڵبازان ومەكری مەكركەران وەك پێغەمبەر (د.خ): بە(عبدالله كوری عەباس)ی فەرمووە: ((**احفظ الله يحفظك احفظ الله تجده تجاهك**))

٤- پەنابردن بەخودا لەشەڕی حەسودان وئەویش بەخوێندنەوەی دوو سورەتی(قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ......) و (قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ.........). چونكە چاكترین پەنا بۆ مرۆڤ پەنابردنە بۆ خوداو بۆ پێغەمبەری خودا. بۆ بەرەنگاربونەوەی هەموو كارەساتێك.

٥- باس نەكردنی نعمەتی خودای گەورە لای حەسودان وەك لە(أبو قتادة)و ئەیگێڕێتەوە كەپێغەمبەر(د.خ) فەرمویەتی: (خەوی خۆش لەخوداوەیە كەسێك خەوێكی خۆش ببینێت لای خۆشەویستانی نەبێت نەیگێڕێتەوە).

## کاریگەرە خراپەکانی ئیرەیی:

١- ئیرەیی ئەبێتە هۆی کاردانەوەی دەرونی وجەستەیی.

٢- باری(تەندروستی) تێك دەچێت ونەخۆش دەکەوێت.

٣- ئیرەیی هۆکارێکە بۆ توشبون بە نەخۆشی (برینی گەدە) وبەرزبونەوەی (فشاری خوێن).

٤- ئیرەیی ئەبێتە هۆی (هەست بەتەنهایی کردن) وتێکچونی باری مێشك.

## گفتوگۆ

١- ئەمانە تەواو بکە:

ئ- لەهۆکاری زیادبوونی ئیرەیی ١-............. ٢- ................ ٣- ...............

ب- ئیرەیی کاریگەری جەستەیی ودەروونی هەیە وەك: ١- ........................ ٢- .............. ٣-................. .

پ- ئیرەیی دووجۆرە: یەکەم.........................

دووەم.......................

٢- بەکورتی باسی چارەسەرکردنی ئیرەیی بکە.

٣- فەرمودەیەکی پێغەمبەر(د.خ) بنووسە دەربارەی رێگرتن لە ئیرەیی.

## پەندەکانی چیرۆکەکانی قورئان
## چیرۆکی یونس( سلاوی خودای لێ بێت )

خودا دەفەرموێت: :(( وَذَا النُّونِ إِذْ ذَهَبَ مُغَاضِبًا فَظَنَّ أَنْ لَنْ نَقْدِرَ عَلَيْهِ فَنَادَى فِي الظُّلُمَاتِ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنْتُ مِنَ الظَّالِمِينَ ﴿٨٧﴾ فَاسْتَجَبْنَا لَهُ وَنَجَّيْنَاهُ مِنَ الْغَمِّ وَكَذَلِكَ نُنْجِي الْمُؤْمِنِينَ ﴿٨٨﴾)) (﴿٨٨﴾الانبياء).

لەم ئایەتانەدا قورئان چیرۆکێك لەچیرۆکەکانی پێغەمبەرو نێردراوەکانمان بۆ دەگێڕێتەوە کاتێك بانگەوازی گەلەکەیان دەکرد بۆباوەڕهێنان بەخوداو دروستکەریان. وئەم چیرۆکە پەندو ئامۆژگاری تێدایە کەئەنگە باوەڕداران سودی لێ وەرئەگرن. ئەویش چیرۆکی پێغەمبەر(یونس)ە (سلاوی خودای لێ بێت). (یونس کوری متی) پێغەمبەرێکی بەخشندە بووە خودای گەورە ناردی بۆ نەتەوەکەی بۆ ئەوەی ئامۆژگاریان بکات وریگەی راستیان نیشان بدات وڕۆژی دواییان بیربخاتەوەو لەچوونە ناوئاگر بیانترسێنێت، وبەهەشتیان لەدڵدا خۆشەویست بکات وفەرمانی چاکەیان پێ بکات، وبانگەوازیان بکات بۆ خودا پەرستی وبەردەوام(**ذو النون**)- (یونس) سلاوی خودای لێ بێت ئامۆژگاری قەومەکەی دەکرد بەلام کەسیان باوەڕیان پێ نەهێناو رۆژێك داهات کەزۆر بێزاربوو لەگەلەکەی وزۆر توڕەبوو، بڕیاری دا بەجێیان بهێڵێت ودوای (سێ رۆژ) خودای گەورە سزایەکی قورسیان بەسەردا بدات. قورئان باسی شوێنی نیشتەجێبونی یونس ناکات، بەلام لەچیرۆکەکەوە دەردەکەوێت کە لە عەراغ دەریابوە. وشیکەرەوانی قورئان وای بۆ دەچن کەخودای گەورە حەزرەتی (یونس)ی بۆخەڵکی (نینوی)(موسڵ) ناردبێت لەئیراق. وتوڕەبونەکەی ڕێی دەریایی پێ گرتەبەرو سواری پاپۆرێك بوو وخودای گەورە هێشتا ڕێگای نەدابوو کە(یونس) گەلەکەی بەجێبهێڵێت، یان نائومێد بێت لێیان وکاتێك خەڵکی دێیەکەی دڵنیابوون لەوەی کە(یونس) بەجێی هێشتوون وسزای خودای گەورە بەرێوەیە، پەشیمان بونەوەو وگەڕانەوە بۆ ڕێگەی راست وتۆبەیان کرد لەخراپەکانیان وداوای لێ خۆشبوون وپاڕانەوە لەخوداو وژن وپیاو کور وکچ ودایکان گریان وفرمێسکی پەشیمانیان رشت وژمارەیان نزیکەی سەد هەزار دەبوون وهەمویان باوەڕیان هێناو خودای گەورە سزاکەی لەسەر لابردن، بەوەی کە بونی کەشتیەکەیان بەدرۆ دەخستەوە.

بەلأم ئەو کەشتیەی کە(یونس) سواری بوو شەپۆلەکانی دەریا لەچوار دەوری کەشتیەکە بەرزبووەو خەریك بوو نقوم بێت، ئەویش وەك نیشانەیەك بۆئەوەی کە یەکێك لەسواربوانی کەشتیەکە تاوانێکی کردووە، خودای گەورە بەکەشتیەکەوە نقومی دەریای دەکات وپێویستە ئەو کەسە دەستنیشان بکرێت وبخرێتە دەریاکەوە، بۆ ئەوەی تەواوی سواربوانی کەشتیەکە رزگاریان بێت. تیروپشکیان کرد بۆئەوەی کێ فریێ بدەنە ناوئاوی دەریاکە (یونس) هەڵبژێردرا، بەلام لەبەرئەوەی (یونس) بەپیاو چاك ناسرابوو دووبارەیان کردەوە، هەر ناوی ئەو دەرچوو سێبارە کرایەوە هەر ناوی ئەو دەرچوو. لەبەرئەوە خستیانە دەریاکەوە ـ هەندێك ئەگێرنەوە کەئەو خۆی خستبێتە ناو دەریاکەوە ـ ونەهەنگێك قوتی دا. لەبەرئەوەی وازی لە بانگەوازی خودای گەورە هێنابوو راسپاردەکەی جێبەجێ نەکردبوو وخودای گەورە نەهەنگەکەی ئامادەکردووە کە(یونس) بپارێزێت ونەبریندراری بکات ونەئێسکەکانی تێك بشکێنێت. شیکەرەوانی ئەم روداوە کەمانەوەی (یونس)ـە لەسکی نەهەنگەکەدا، بۆچونی جیاوازیان هەیە هەندێکیان دەڵێن ئێوارە قوتی داوەو کاتی خەوتنان دەری کردۆتە دەرەوەو هەندێکیشیان بۆ ئەوە دەچن کە ماوەی سێ رۆژ ماوەتەوەو هەندێکیان بۆ حەوت رۆژ دەچن.

**یونس لەسکی نەهەنگەکەدا :**

کاتێك یونس لەسکی نەهەنگەکەدا هەستی بەدڵتەنگی کرد ، کەتاریکی ناوسکی نەهەنگەکەو تاریکی دەریاو تاریکی شەو دایگرت، داوای لێ خۆشبونی لەخودا کردو نزای (لا إله الا أنت سبحانك إني كنْتُ من الظالمين)ی خوێندو خودای گەورە نزاکەی لێ وەرگرت ونەهەنگەکە(یونس)ی فرێدایە دەرەوە. (**فلولا إنه كان من المسبحين للبث في بطنهِ الى يوم يبعثون**) ولەسکی نەهەنگەکە کەبەروتی وبەبێ جل وبەرگ هاتە دەرەوەو خودای گەورە داری کولەگەی رواندو کە دارێکە ناسراوە بەوەی گەڵاکانی پان وبەرەکەی لەدروست بونیەوە ئەخورێت بەکاڵی وبەکوڵاوی وئەو دارە بۆ زۆر نەخۆشی سودی هەیە بەتایبەتی بەهێزکردنی مێشك ودەروونی مرۆڤ دوای ئەوەی کە(یونس) هاتەوە خۆی گەڕایەوە بۆلای نەتەوەکەی کەبەجێهێشتبون لەکاتی تورەیی دا.

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کەخودای گەورە دروستکەری هەموو شتەکانەو هەموو کارەکانی بەدەستە، وەك چۆن(یونس)ی خستە سکی نەهەنگەکەوە دوای ئەوە رزگاری کرد بۆ ئەوەی بگەرێتەوە بۆ ناو نەتەوەکەی بۆ ئەوەی فەرمانی خودای گەورە بەجێبهێنێت.

## گفتوگۆ

١- ئەو ماوەیە چەندبوو کەحەزرەتی یونس لەسکی نەهەنگەکە بەسەری برد؟
٢- ئایا نەهەنگەکە هەر لەو شوێنەدا فڕێ دا کەتیادا قوتی دابوو؟
٣- ئایا نەتەوەکەی ناسیانەوە کاتێك گەڕایەوە بۆلایان؟

## وانەی پانزەم

# هاوەڵان وپلەوپایە یان لای موسڵمانان

**هاوەڵان:** ئەو کەسانەن کە هاورێیەتی پێغەمبەریان(د.خ) کردووە یان پێغەمبەریان(د.خ) لەژیان دا بینیوەو باوەڕیان پێ هێناوەو ئەوانیش ژمارەیان زۆرەو ژیانیان پڕە لەڕوداوی مەزن، کە مەودای بەهێزی باوەڕیان نیشاندەدات ئەوانەی کە خزمەتیان بە ئاینی ئیسلام گەیاندووە بە زانست وبەکردەوەو بەرەوشتی بەرزیان، وهەموو شتێکی بەنرخیان بەخشیوە لەپێناو بەرز ڕاگرتنی ووشەیی(**لاإلـه الا الله**) و وێنەی برایەتی وخۆشەویستی وپێکەوە ژیانیان لەوەدا دیارە کەلە هەموو ناکۆکیەکی خۆی وکەسێتی تایبەت بەخۆیان دوور ڕاگرتووە کەئەبێتە هۆی جیاوازی لەیەکدی دورکەوتنەوەیان. لەبەرئەوە ئەمانە بوون بەپێشەنگی موسڵمانان لەبانگەوازکردن بۆ ڕاستی وپابەندبون بەرەوشتی بەرزو هەڵسوکەوتی دروست لەگەڵ کۆمەڵگاو بە لەخۆبوردەیی هاوەڵان کۆمەڵگای ئیسلامی دامەزراوە، لەسەر بناغەی خۆشەویستی وهاریکاری وبەخشین. وخودای گەورە باسی لەو بەخشندەییەی.ئەوانی کردووە وەك دەفەرموێت. ﴿مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ اللَّهِ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ...﴾ (الفتح٢٩).

هاوەڵان هەموویان دادوەرن ونابێت جیاوازی بکەین لە نێوانیان داو یان لەگەورەیی ئەوان کەم بکەینەوە، وهەموو موسڵمانان هاوڕان لەسەر ڕێگرتن لە بریندارکردن وقسەکردن بەخانەوادە وهاوسەر وهاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ).

لەهاوەڵە ناسراوەکانی پێغەمبەر(د.خ)(١٠ مژدە پێدراوەکەی بەهەشت) کە ئەوانەش چوار جێنشیەکەی پێغەمبەر(د.خ)(أبوبکر)(عومەری کوڕی خەتاب)(عوسمانی کوڕی عەفان)و(علی کوڕی أبی تالب)(ڕەزای خودایان لێ بێت).

هاوەڵان (أبوعبیدة الجراح)و(تەڵحەی کوڕی عوبێوللاَ)(زوبێر کوڕی عەوام)و(عەبدولڕەحمانی کوڕی عەوف)و(سەعدی کوڕی ئەبو ووقاس)و(سەعیدی کوڕی زەید)(ر.خ) و هاوەڵان تەنها لەپیاوان نەبوون بەڵکو ژنە هاوەڵانیش هەبوون وەك (ژنانی پێغەمبەر(د.خ))وکچەکانی وهەڵبژاردەی دیکە لەژنانی(قورەیش)و(یثرب)ئەوانەی بەشداربوون لە بانگەوازکردن وبڵاوکردنەوەی ئاینی پیرۆزی ئیسلام.

بەمانە هەموویان ووشەی(**لاالە الاالله**)بەرز ڕاگیراو خودای گەورە ئیسلامی بەڕێزو پیرۆزکرد.

## گفتوگۆ

١- هاوەڵان کێن وژیانیان چۆن بووە؟

٢- ناوی هەندێك لەهاوەڵانی ژن وپیاو ئەوانەی ئەیانناسیت بنووسە؟

٣- دروست نیە بریندارکردنی یان کەمکردنەوەی پیرۆزی هاوەڵان. ئەمە روون بکەرەوە؟

٤- ئەو ئایەتە بنووسە کەخودای گەورە تیایدا باس لەبەرێزی وپیرۆزی هاوەڵان دەکات؟

٥- گرنگترین ئەو شتانە چین کەهاوەڵان پێی ناسراون وشیاوی پێشەنگین بۆ موسڵمانان؟



# چەند وێنەیەك لەژیانی هاوەڵان

هاوەڵانی پێغەمبەر(د.خ) هەموو وەك ئەستێرەن درەوشاوەن وئەگەر چاو بخشێنین بەژیانی هەرکامێکیان مەشخەڵێکە روناکیمان پێ دەبەخشێت، لەبەرئەوە تەنها ژیانی دوو لەهاوەڵانتان بۆ باس دەکەین ئەوانیش:

١- عومەری کوڕی خەتاب: لەدەستپاکی.

٢- علی کوڕی ئەبی تالیب: لەدادوەری وخوداپەرستی ودانایی وزانست دا.

## ١- عومەری کوڕی خەتاب:

### ئ- دەستپاکی لەوەرگرتنی جێنشینیدا:

کاتێك جێنشین (ئەبوبەکر) ماڵئاوایی کرد لەژیان جێنشینی درا بە(عومەر) بەزۆرە ملێ ولەووتارێکی دا کەبۆموسڵمانەکانی خوێندەوە گوتی: ((**خوداپەرست بن وپشتگیرم بن بۆخۆتان بەوەی کەخۆنەویست بم، وپشت بەست بن بۆم بەوەی فەرمان بەچاکە بکەم ورێگریم لەخراپە، وئامادەی هەموو ئامۆژگاریەکم بەوەی کەخودای گەورە منی کردووە بەجێبەجێکاری کارەکانتان**)).

### ب- پاکی لەگەڵ نەفسی خۆیدا:

کاتێك(عومەر) پێشوازی لەمردن دەکرد بە (عەبدوڵا)ی کوڕی گوت سەرم لەسەر سەرینەکە لادەو بیخەرە سەرزەوی بەڵکو خودای گەورە تەماشام بکات وبەزەیی پێمدا بێتەوە.

### پ- بێ گەردی لەخواردنیدا:

جێکارەکەی (عومەر) لەئازربایجان شیرینی بەدیاری ناردبوو بەڵام کە(عومەر)ی کوڕی خەتاب لەنێردراوەکەی پرسی ئایا هەموو خەڵك لەم خواردنە ئەخۆن؟ لەوەڵامدا گوتی: نەخێر. ئەمە خواردنی تایبەتە بەگەورەکان و(عومەر) توڕەبوو گوتی: (**حوشترەکەت کوا دیاریەکەت هەڵگرەو بیبەرەوە بۆخاوەنەکەی وپێی بڵێ: (عومەر فەرمانت پێدەکات کە لەهیچ خواردنێك مەخۆ هەتا هەموو موسڵمانان پێش تۆ لێی تێرنەبن ونەیخۆن**).

### ت- بێ گەردی ودەستپاکی لەدابەشکردنی دەستکەوتدا:

رۆژێك کە(عومەر) چووە سەر(بڵندگۆ ـ منبەر) بۆخوێندنەوەی گوتارەکەی دوای سوپاسی خودا بەوە دەستی پێکردو گوتی: (گوێ بگرن ڕەحمەتی خوداتان لەسەربێت) یەکێك لەموسڵمانەکان هەستاو گوتی: بەخودا گوێ ناگرین. عومەر پرسیاری لێ کرد گوتی: بۆ ئەی (سەلمان)؟ بەڵام(سەلمان) وەڵامی دایەوەو گوتی: تۆخۆت لەئێمە جیاکردۆتەوە بۆهەر یەکەمان پارچە قوماشێکت بەخشیوە بەلام بەخۆت دووپارچە (عومەر) هەڵوێستەیەکی کردو چاوی بەریزی

موسڵمانانندا ڕوانی و گوتی: کوا(عەبدوڵای کوڕی عومەر)و وەڵامی دایەوە هەستاو گوتی: من لێرەم ئەی سەرکردەی موسڵمانان. ئەوجا(عومەر) بە(سەلمان)ی گوت وەك ئێوە ئەبینن من پیاوێکی باڵابەرزم. وئەو پارچە قوماشە بۆمن کورت بوو لەبەرئەوە (عەبدوڵا)ی کوڕم قوماشەکەی خۆی پێدام بۆئەوەی کراسەکەم درێژبێت.

(سەلمان) دوای فرمێسکی باوەڕبوون بەعومەر گوتی: سوپاس بۆخودا ئێستا گوێت لێ دەگرین وفرمانەکانت جێبەجێدەکەین ئەی میری باوەڕداران.

### ٢- پێشەوا (عەلی کوڕی ئەبی تالیب):

پێشەوا عەلی کەسایەتیەکی دەگمەن بوو لەدادوەری وخوداپەرستی ودانایی وزانست دا. وباس لە هەر یەك لەم سیفەتە بەرزانەی دەکەین:

#### ا- دادوەرییەکەی:

عەلی کوڕی ئەبی تالیب جیاوازی نەئەکرد لەبەخشین دا لەنێوان لایەنگران وبەرهەڵستکاراندا وبەیەکسانی لەگەڵیاندا هەلسوکەوتی دەکرد. وەك فەرمویەتی: **ئەگەر سامان سامانی من بوایە یەکسان ئەبووم لەگەڵیاندا، چۆن ئەگەر پارەو سامان هی خودابێت وئەمانە هەموو بەندەی ئەوین.**

#### ب- خودا پەرستیەکەی:

داوا لەپێشەوا کرا کەبچێتە تەلاری پاشایەتی بەڵام ئەو پشتی تێکردو نەچوو وئەیفەرموو: (ئەم تەڵاری خەیاڵە نیشتەجێ نابم تیایدا). لەبەرئەوە وازی لەتەلاری میری هێناو چوو لەناو خانویەکی دروستکراو لەقوڕ جێنشین بوو.

#### پ- داناییەکەی:

پێشەوا پێکهاتەیەك بوو لەدانایی. بەسەلیقەی پاکی وتێکەڵی لەگەڵ پێغەمبەر(د.خ) ئەگەر کەسێك لەگەڵ پێغەمبەردا ژیابێت لەمنداڵیەوە ئەبێت چۆن ڕەنگی دابێتەوە لەژیانی داو چۆن لەدانایی پێغەمبەری وەرگرتبێت ولەسەر زمانی ئەو فەرموودەی گێرابێتەوە؟

#### چەندنموونەیەکی لە گوتە پڕ داناییەکانی:

- دەستپاکی جوانکاری هەژارییەو سوپاسگوزاریش جوانکاری دەوڵەمەندییە.
- ڕۆژی دادوەری بۆ ستەمکار قورسترە لە ڕۆژی ستەم لە ستەملێکراو.

#### ت- زانستەکەی:

جوانی قورئان وپیرۆزیەکەی لەدڵیدا چەسپابوو وبوە زاناو شارەزا لەبواری زانستی قورئاندا وزۆر بەباوەڕەوە ئەیفەرموو:(پرسیارم لێ بکەن ئەوەی ئەتانەوێ دەربارەی قورئان، بەخودا هیچ ئایەتێك نیە کەمن نەزانم کەی هاتۆتە خوارەوە، ئایا بەشەو بووە یان بەڕۆژ).

## گفتوگۆ

چەند پرسیارێك:

١- باسی چاکەی عومەر بکە لەگەڵ نەفسی خۆی دا.

٢- پێشەوا عەلی چی گوتوە دەربارەی دادوەری؟

## وانەی حەڤدەم

# بەرپرسیارێتی لەئیسلامدا

پێغەمبەر(د.خ) فەرمویەتی ((**كلكم راعٍ وكلكم مسؤول عن رعيته، فالامام راعٍ وهو مسؤول عن رعيته، والرجل راعٍ على أهل بيته وهو مسؤول عن رعيته، والمرأة راعية في بيت زوجها وهي مسؤولة عن رعيتها، والرجل راعٍ في مال ابيه وهو مسؤول عن رعيته، فكلكم راعٍ وكلكم مسؤول عن رعيته**)).

رواه البخاري.

**الراعي:** واتە ئەوەی كاری موسڵمانان بەڕێوەدەبات وەك: (فەرمانڕەواو بەرپرس ومێردو خاوەن كار... هتد).

**الرعية:** هەموو ئەو كەسانەی كە ئەكەونە ژێردەست ودەسەڵاتی بەرپرسان لەلێپرسراوو مێردو... هتد.

الامام: بە واتای فەرمانڕەواو سەرۆك وبەرپرس دێت.

**باسەكە:**

بەرپرسێتی لەئیسلامدا سپاردەیە وشەریعەتی ئیسلام بنەمای بەرپرسیارەتی گشتگیری لەكۆمەڵگای ئسلامیدا بڕیار داوە. وهەر تاكێك هەڵگری بەرپرسێتییە بەپێی ئەو شوێن ودەسەڵاتەی پێی دراوە. لەپێناو دابینكردنی بەرژەوەندی گشتیدا لەكۆمەڵگایەكی دروست دا كەخۆشەویستی وبرایەتی ئەندامەكانی پێكەوە لكاندبێت.

فەرمودەكەی پێغەمبەر(د.خ) كۆمەڵێك لەو بەرپرسێتییە تایبەتیانەی باس كردووە كەتایبەتن بەهەر ئەندامێك لەكۆمەڵگەكە (فەرمانڕەوا) و(پیاوان و ژنان) و(كارمەندان) لەخۆدەگرێت كە بە ووشەی (راعٍ - واتە شوان) دەستەواژەی پێ دەكات. كە ئەمانە لەخۆدەگرێت:

### ١- چاودێری (سەرۆك) بۆ نەتەوەكەی وبەرپرسێتی لێیان:

سەرۆك بەرپرسی یەكەمە لەوڵاتدا. ولەسەریەتی یاساكان جێبەجێبكات وپابەندبێت پێیان لەپێناو بەرژەوەندی گشتیدا. وسووربێت لەسەر پاراستنی ئاسایشی وڵات وپاراستن وجێگیربوونی ئاسودەیی لەنێوان ئەندامانی كۆمەڵدا لەسەر ئاستی ناوەوە ودەرەوە.

### ٢- چاودێری كردنی پیاوان بۆ خێزانەكانیان وبەرپرسیتی ئەوان:

ئاینی ئیسلام گرینگی داوە بەخێزان چونكە خێزان بناغەی دروست بوون ویەكبوونی كۆمەڵگایە. وسەرۆكایتی خێزانی بەخشیوە بەپیاو وبەرپرسێتی خستۆتە ئەستۆی لە دابین كردنی پێویستی ژیان وپەروەردەكردنیان لەسەر رەوشتی جوان و زانست بەدەستهێنان.

**٣- چاودێری (ئافرەت-ژن)بۆ ماڵی مێردەکەی وبەرپرسێتی ئەوان:**

ئاینی ئیسلام بەرپرسیارێتی ئافرەتی بەشێوەیەك دیاری کردوە، کە گونجاوە لەگەڵ پێکهاتەی جەستەی وسۆزداریدا، وهێنانەدی بەختەوەری خێزانی خستۆتە ئەستۆی بەجێبەجێکردنی کاروباری ماڵ وپەروەردەکردنی منداڵەکانی وپاراستنی سامانی مێردەکەی وباش خەرج کردنی.

**٤- چاودێری کردنی کرێکار بۆکارەکەی:**

هەموو کرێکارێك سپێردراوە بۆ ئەو کارەی لەئەستۆی دایە، کە بەباش جێبەجێ بکات وکەم تەرخەم نەبێت لەکارەکەی بەم شێوەیە دڵسۆز دەبێت.

## ئەنجامی کەم تەرخەمی ونابەرپرسێتی لەکارەکاندا:

١- ئەبێتە هۆی لەناوچوونی مافی خەڵك وبڵاوبوونەوەی گەندەڵی.

٢- لە ناوچوونی مافی ژن ومێردایەتی وتێکچوونی خێزان.

٣- بڵاوبوونەوەی گوێ نەدان وخۆپەرستی لەناو کۆمەڵدا.

٤- ئەبێتە هۆی گیرۆدەبوونی نیشتمان بەداگیرکاری ودواکەوتن.

## گفتوگۆ

١- تێروانینی ئیسلام چییە بۆ بەرپرسیارێتی؟

٢- ئەرکی فەرمانڕەوا یان سەرۆك چییە بەرامبەر بە گەل؟

٣- بەرپرسیارێتی پیاو لە خێزاندا روون بکەرەوە؟

٤- بەرپرسیارێتی(ژن- ئافرەت) روون بکەرەوە؟

٥- کرێکاری دڵسۆز کێیە؟

٦- خراپەکانی خۆدزینەوە لە بەرپرسیاێتی چین؟بەکەمتەرخەمی تیایدا؟

٧- وەڵامی راست هەڵبژێرە لەناوکەوانەکاندا بۆ هەریەك لەم بۆشاییانەی لای خوارەوە.

ئـ- .............بەرپرسی یەکەمە لەوڵاتدا. (وەزیر ، سەرۆك)

ب- ئیسلام بەرپرسیارێتی کاروباری خێزانی سپاردووە بە .......... (ژن ،پیاو)

پ- ئیسلام بەرپرسیارێتی پەروەردەکردنی منداڵی سپاردوە بە.......... (ژن ، پیاو)

ت- هەموو کرێکارێك............لەسەر ئەو کارەی پێی هەڵدەستێت. (بەرپرسە، زۆرلێکراوە)

## وانەی هەژدەم

# دادوەری کۆمەڵایەتی لەئیسلامدا

### کورتەیەك دەربارەی دادوەری کۆمەڵایەتی :

مەبەست لە دادوەری کۆمەڵایەتی ئەوەیە کە هەموو ئەندامانی کۆمەڵگا بەشدارن لەپارێزگاری کردن لە بەرژەوەندییە گشتی وتایبەتیەکان وبەرنگاربوونەوەی گەندەڵی وزیان گەیاندنی مادی ومەعنەوی، بەجۆرێك کە هەموو ئەندامێك لەپاڵ ئەو مافانانەی کە هەیەتی ئەرکی زۆری لەسەر شانە بەرامبەر ئەوکەسانەی کە ناتوانن پێویستیەکانیان جێبەجێبکەن.

بەگەیاندنی ئەو پێداویستیانە بۆیان ودورخستنەوەی خراپە لێیان وپارێزگاری کردنیان.

پێغەمبەر (د.خ) فەرمویەتی: (مثل المؤمنين في توادهم وتراحمهم وتعاطفهم كمثل الجسد إذا اشتكى منه عضوٌ تداعى له سائر الجسد بالسهر والحمى). (رواه البخاري ومسلم).

کەواتە دادوەری کۆمەڵایەتی پێویستییەکی کۆمەڵایەتییە.

### دادوەری کۆمەڵایەتی سودێکی مادییە یان چی؟

دادوەری کۆمەڵایەتی بەندنیە لەسەر سوودی مادی، هەرچەندە بوونی مادە لەبنەما سەرەکیەکانییەتی، بەڵام ئەوە تێدەپەرێنێت ومەبەست لێی هەموو پێویستییە کۆمەڵی وتاکییەکانە لە سوودی مادی ومەعنەوی وکۆمەڵایەتی روناکبیری، بەمە هەموو مافە سەرەکیەکانی مرۆڤ لەخۆ دەگرێت تاك یان کۆمەڵ بن.

### دادوەری ئەم واتایانە دەگرێتە خۆ:

چاکەکردن ، بەزەیی، چاکە، بەخشین، برایەتی، هاوکاری...هتد.

**بەڵگە نەقلی و ئەقلیەکان کە لەسەر پێویستی دادوەری کۆمەڵایەتی کردوە:**

**یەکەم:**

**أ- بەڵگەی نەقلیەکان بریتین لە:**

١- قورئانی پیرۆز، خودا دەفەرموێت: ﴿يَسْأَلُونَكَ مَاذَا يُنْفِقُونَ قُلْ مَا أَنْفَقْتُمْ مِنْ خَيْرٍ فَلِلْوَالِدَيْنِ وَالْأَقْرَبِينَ وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ وَمَا تَفْعَلُوا مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ اللَّهَ بِهِ عَلِيمٌ﴾ (٢١٥ البقرة).

٢- خودا دەفەرموێت: : ﴿لَيْسَ الْبِرَّ أَنْ تُوَلُّوا وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَلَكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ وَآتَى الْمَالَ عَلَى حُبِّهِ ذَوِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَالسَّائِلِينَ وَفِي الرِّقَابِ وَأَقَامَ الصَّلَاةَ وَآتَى الزَّكَاةَ وَالْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَاهَدُوا وَالصَّابِرِينَ فِي الْبَأْسَاءِ وَالضَّرَّاءِ وَحِينَ الْبَأْسِ أُولَئِكَ الَّذِينَ صَدَقُوا وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ﴾ (١٧٧ البقرة).

٣- خودا دەفەرموێت: ﴿..وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى وَلَا تَعَاوَنُوا عَلَى الْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ..﴾ (٢ المائدة).

**ب- فەرموودەکان:**

١- عن سالم عن أبيه أن رسول الله (ص) قال **((المسلم اخو المسلم لايظلمه ولايخذله)) و((من كان في حاجة اخيه كان الله في حاجته)) و((من فرج عن مسلم كربة فرج الله بها عنه كربة من كرب يوم القيامة ومن ستر مسلماً ستره الله يوم القيامة)).**

٢- عنْ سهل بن سعد قال قال رسول الله(ص) **((انا وكافل اليتيم في الجنة كهاتين )) واشار باصبعيه (السبابة والوسطى).**

٣- قال رسول الله(ص) وكان في حالة السفر والشدة: **((من كان معه فضل ظهر فليعد به على من لاظهر له ومن كان معه فضل زادٍ فليعد به على من لازاد له)).**

**دووەم: بەڵگە ئەقڵیەکان:**

لای کەس شاراوە نیە ئەو کۆمەڵگەیەی بەندە لەسەر هاریکاری ودادوەری کۆمەڵایەتی لەناو ئەندامەکانی دا هاتۆتەدی وەستکردن بەخۆشی وبەختەوەری باڵی بەسەر هەمویان داکێشاوە ئەوە کۆمەڵگەیەکی بەهێزو یەکگرتوو پارێزراوەو هیچ بارگرژی وتێکچونێك کاری تێ ناکات.

## جۆرەکانی دادوەری کۆمەڵایەتی:

ئەو چین وتوێژانەی دەست بەردارێتی دەیانگرێتەوە.

١- دەستە بەری ناوخێزان: پەیوەندی خێزان وڕێکخستنی ودادوەری لەنێوان (پیاو وژن لەمامەڵەی چاك لەنێوانیاندا و بەڕێوەبردن وپارێزگاریکردن لەمندالآن لەچاودێری وپەوەردەکردنیان).

٢- دەستەبەری تەمەن گەورەو پیرو تەلآق دراو وبێوەژناندا.

٣- هاوکاری هەتیوان.

٤- دەستەبەری هەژارو کەم دەرامەتەکان.

٥- دەستەبەری مافی دراوسێییەتی.

٦- بەزەیی بەخاوەن پێداویستییە تایبەتەکان وەك: (نابینا ، کەروڵاڵ وشێت).

## هۆکارەکانی ئیسلام لەجێبەجێکردنی هاوسەنگی کۆمەڵایەتی:

جێبەجێکردنی هۆکارەکانی هاوسەنگی پەیوەستە بەپەروەردەی ویژدان وکاریگەری هەستکردنە بەبەرپرسیارێتی ناخی مرۆڤ وئەوهۆکارانە بەندن لەسەر دوو هۆکار بۆئەوەی دەستەبەرییەکەی بێتەدی.

١- بەرپرسیارەتی کۆمەڵگە: دەولەت بەتەنهاو بەبێ یارمەتی ئەندامانی کۆمەڵگە ناتوانێت دادوەری کۆمەڵایەتی پیادەبکات یان بەخشین ویارمەتیدانی خەڵك.

٢- بەرپرسیارێتی تاك:

### یەکەم - هۆکاری ئەرکەکان:

ئ- **زەکات.**

ب- **کەفارەت:** ئەوەی کەموسڵمان دەیدات بەخێر بەرانبەر گوناهێك کەکردویەتی بەمەبەستی لێ خۆشبون.

پ- **سەرفترە(صدقة الفطر):** پێویستە لەسەر هەموو پیاوێك وئەوەی کەبژێوی ژیانی ئەکەوێتە ئەستۆیەوە وەك ژن ومندالْ ودایك وباوك وخزمەتکار.

ت- **فریاکەوتنی نەدار:** ئەویش بەپێدانی پارە یان هەر هاوکاریەکی دیکە لەخواردن وجل وبەرگ بۆخزمان یان دراوسێ.

ج- **نەزر (النذور):** ئەوەی کەموسڵمان بریاری ئەدات لەپارە بیکات بەخێر.

### دووەم ـ هۆكاری بەخشینی خۆبەخش:

**ئـ- (وەقف – الوقف):** ئەوەی كەپارەیەك ئەخاتە وەقفەوە بۆئەوەی سودەكەی لەبەرژەوەندی موسڵماناندا بەكاربهێنرێت.

**ب- (وەسیەت – الوصية):** كەیەكێكە لەهۆكاری دەستە بەری كەموسڵمانێك وەسیەت بكات پێش مردنی بەبەخشینی سێیەكی سەروەتەكەی بۆ خێرو چاكە.

**پ- (بەخشین – الهبة) و(دیاری – الهدية):** لەهۆكارەكانی بڵاوبونەوەی خۆشەویستی و چاكەكردن وپتەوكردنی پەیوەندی لەنێو ئەندامانی كۆمەڵدان.

## بەرپرسیارێتی دەوڵەت لەدەستە بەری كۆمەلایەتی دا :

بەرپرسێتی دەولەت زۆر قورس وترسناكە لەهێنانەدی دەستە بەری كۆمەڵایەتی. لەبەرئەوەی دەوڵەت بەرپرسی سەرەكییە لەچینی هەژاران، ئەوانەی هیچ جۆرە دەرامەتێكیان نیە وپێویستە بەرپرسێتی دەوڵەت لەم خالانەدا دیاری بكەین.

**١- دابینكردنی سەرچاوەی دەرامەت:**

حكومەت ناتوانێت دەستەبەری هەژاران بكات هەتا (خانەیەكی پارە)ی تایبەت نەكرێتەوەو ببێتە سەرچاوەیەك بۆ بەخشینی یارمەتی پێیان، وئەتوانین ئەو سەرچاوانە دەست نیشان بكەین كەدەوڵەت دەتوانێت دابینیان بكات، لەوانە:

ئـ- كۆكردنەوەی زەكات لەپارەی دەوڵەمەندەكان.

ب- سود وەرگرتن لەموڵكی وەقف.

پـ- سود وەرگرتن لەدەستەبەری كۆمەڵایەتی.

د- سود وەرگرتن لەپەنابردن بۆ دەوڵەمەندەكان لەكاتی پێویستدا.

**٢-دابەشكردنی پارە بەسەرپێ شیاوانی دا:**

پێویستە لەسەر حكومەت هەڵسێت بەدابەشكردنی پارە بەسەر ئەوانەی دەستەبەری كۆمەلایەتی دەیانگرێتەوە.

**٣- دۆزینەوەی هەلی كار بۆئەوانەی توانای كاركردنیان هەیە.**

## گفتوگۆ

١- مەبەست لەدەستەبەری کۆمەلایەتی چییە؟ روونی بکەرەوە.

٢- ئەو هۆکارە خۆبەخشانە چین کەدابینی دەستەبەری کۆمەڵایەتی دەکەن؟ بیان ژمێرە.

٣- (بەخشین - الهبة) و (دیاری - الهدية). چی دابین دەکەن؟

٤- مەبەست لە(کەفارەت) چییە؟

وانەی نۆزدەم

## دەستەبەری هەتیو

**هەتیو:**

ئەو منداڵەیە کە باوکی نامێنێت پێش باڵغ بوونی، بەڵام ئەوەی دایکی لە دەست بدات هەتیو نیە، چونکە باوکی بەخێوی دەکات و ئەگەر هاتوو منداڵەکە باڵغ بوو ئەوا بە هەتیو دانانرێت، چونکە پێویستی بەکەس نابێت چاودێری بکات.

**دەستەبەری هەتیو:**

ئەویش هەستانە بەکاروباری هەتیو لە پەروەدەکردن و فێرکردن و ئەوەی هەتیو پێویستی پێیەتی، و ئەو کەسانەی بەم کارە هەڵدەستن خزمن ئەگەر نەبوو، ئەوە پیاو چاکان یان حکومەت بەم کارە هەڵدەستێت. لە ڕێگەی فەرمانگەی (چاودێری کۆمەلایەتی – الرعایة الاجتماعیة) و خودای گەورە ئەم ئەرکە گرنگە دوپات دەکاتەوە ئەویش بەچاودێریکردنی هەتیو و نەچەوسێنرێتەوە و ئازاری دەروونی و جەستەیی نەدرێت. بەڵکو پێویستە بە چاکە مامەڵەکردنی و بەوگرنگییەی کە خودای گەورە بە هەتیوی داوە وەك دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَقْرَبُوا مَالَ الْيَتِيمِ...﴾ (الانعام ١٥٢).

**پێویستیەکانی سەرشانی دەستەبەری هەتیو:**

١- چاکەکردن بەرامبەری و نزیك بونەوە و دەربڕینی خۆشەویستی بۆی.
٢- پاراستنی سەروەت و سامانی هەتیوەکە.
٣- گرنگی دان بە پۆشاك و خواردن و چاودێری کردنی زانستی و تەندروستی هەتیوەکە.
٤- ڕێنمایی کردنی بەوەی کە هاوڕێیەتی لەگەڵ خەڵکانی خراپدا نەکات.

**هەڵوێستی ئیسلام بەرامبەر هەتیو لەم چەند خاڵە دا کورت دەکەینەوە:**

١- پێویستە مامەڵەیەکی چاك لەگەڵ هەتیودا بکەین. وەك پێغەمبەر (د.خ) کە دەستی بەزەیی و سۆزی بەسەر هەتیواندا دەهێنا.

٢- پێغەمبەر (د.خ) پلە و پایەی بەرپرسی هەتیو لای خودای گەورە روون دەکاتەوە، کە دەفەرموێت: **((انا وكافل اليتيم في الجنة كهاتين واشار باصبعيه السبابة والوسطى))** رواه البخاري.

٣- رێگرتن لە نەخواردنی پارەی هەتیو و دەستکاری کردن و خەرج کردنی دور لەبەرژەوەندی هەتیوەکە.

خودا دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَقْرَبُوا مَالَ الْيَتِيمِ إِلَّا بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ...﴾ (الانعام١٥٢).

باشترین بەڵگە ئەوەیە کە پێغەمبەر (د.خ) خۆی هەتیو بووە و خودای گەورە لای مامی جێی بۆ کردۆتەوە و نەزان بووە لە زانینی کاروباری ئاین خودای گەورە فێری کردوە، هەژار بووە خودای گەورە بە بەرنامەی ئیسلام دەوڵەمەندی کردووە، کە بۆ هەموو نەوەی ئادەم لە سەر زەوی ناردووە. وەك لە سورەتی (زوحا) هاتووە.

**گفتوگۆ:**

١- چی پێویستە لەسەرمان بەرامبەر کەسێك داوای یارمەتیمان لێ بکات؟
٢- هەتیو کێیە؟
٣- ئەو کەسەی بەرپرسێتی هەتیو ئەگرێتە خۆ کێیە؟
٤- پێویستیەکانی بەرپرسی هەتیو باس بکە؟
٥- هۆی هاتنە خوارەوەی سورەتی (زوحا) چییە؟
٦- فەرمودەیەك لە بارەی گرنگی بەرپرسیاریەتی هەتیو بنووسە؟

وانەی بیستەم

## ڕێگرتن لە بەفیڕۆدان و زیادەڕۆیی

**بەفیڕۆدان و زیادە ڕۆیی:**

ئەوەیە کە پارەی زۆر سەرف بکەین یان لە ڕادەی ئاسایی خۆی لە خواردن و پۆشاک و نیشتەجێ بوون و لە خۆشیەکانی ژیان.

خودای گەورە فەرمانی ئەوەمان پێ دەکات کە زیادە ڕۆیی نەکەین کە دەفەرموێت: ﴿..كُلُوا وَاشْرَبُوا وَلَا تُسْرِفُوا إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ﴾ (٣١ الاعراف).

چونکە سامان ڕاسپاردەیە پێویستە بە باشی و بەشێوەیەکی تەندروست مامەڵەی پێ بکەین و بە خراپی بەکاری نەهێنین لەبەرئەوەی یەکێکە لە نعمەتەکانی خودای گەورە. و موسلمان بەرپرسیارە لای خودای گەورە بەرامبەر بەکارهێنانی سەروەتەکەی وەک دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً إِلَى عُنُقِكَ وَلَا تَبْسُطْهَا كُلَّ الْبَسْطِ فَتَقْعُدَ مَلُومًا مَحْسُورًا﴾ (٢٩ الاسراء).

خودای گەورە لەم ئایاتەدا بنەمایەکی داناوە، ئەویش ئەوەیە کە چاکترین کار ناوەندێتی نە مەسرەفی زۆر و نە بە ڕەزیلی کردن و دەست گرتنەوە بەڵکو لە ناوەندی هەردووکیان.

**بوارەکانی بەفیڕۆدان و زیادەڕۆیی:**

بەفیڕۆدان لە هەموو بوارەکانی ژیان هەیە، بەڵام دیارترینیان ئەمانەن:

١- زیادەڕۆیی لە بەکارهێنانی ئاوو کردنەوەی بەلوعەی ماڵان بۆ ماوەیەکی زۆر بەبێ هۆ.

٢- زیادە ڕۆیی لە بەکارهێنانی کارەبا و نەکوژاندنەوەی ڕوناکی و ئامێرە نا پێویستەکان.

٣- زیادەڕۆیی لە بۆنە ئاینی و کۆمەڵایەتییەکاندا، وەک ئاهەنگی ژن هێنان و لە دایک بوون و تەعزییە و دەعوەتی خواردنی گەورە، بەبێ گوێدان و زیادەڕۆیی لە خواردن و خواردنەوە تیایاندا.

**زیان و دەرەنجامەکانی بە فیڕۆدان:**

١- سەرف کردنی پارە لەشتی ناپێویست دا.

٢- بەرەنگاری فەرمانی خودا و مل کەچی شەیتانی تیایە.

٣- جڵەوشلکردن بۆ ئارەزووەکان و دوورکەوتنەوە لە ڕاستی.

٤- دەبێتە هۆی نەریتی خراپ و خۆ هەڵکێشان و گوێ نەدان.

## گفتوگۆ:

١-واتای زیادە ڕۆیی و ئیسراف چییە؟

٢-خـوداى گـەورە بەچـى فـەرمانمان پـێ دەكـات لـە خـەرجكردنى دەرامـەت بـۆ پێداویستییەكانمان؟

٣-هەندێك لە بوارەكانى زیادە ڕۆیی باس بكە؟

٤-گرنگترین زیانەكانى بەفیڕۆدان بڵێ؟

## ئەمانە تەواو بكە:

١. موسوڵمان بەرپرسیارە بەرامبەر ........ كە ئەبێت چۆن بیكات.

٢. باشترین كاركردن ..........كەیەتی.

٣. بەخشینەوە لە كاروبارى .......... .

٤. قال تعالى: ﴿ولاتجعل يدك.......... إلى عنقك ولاتبسطها كل البسط فتقعد ..........﴾.



یەكێك لە نیشانەكانى بەفیڕۆدانى ئاو

### وانەی بیست و یەکەم

## حەج و مەرجەکانی

خودای گەورە دەفەرموێت: (( وَإِذْ بَوَّأْنَا لِإِبْرَاهِيمَ مَكَانَ الْبَيْتِ أَنْ لَا تُشْرِكْ بِي شَيْئًا وَطَهِّرْ بَيْتِيَ لِلطَّائِفِينَ وَالْقَائِمِينَ وَالرُّكَّعِ السُّجُودِ ﴿٢٦﴾ وَأَذِّنْ فِي النَّاسِ بِالْحَجِّ يَأْتُوكَ رِجَالًا وَعَلَىٰ كُلِّ ضَامِرٍ يَأْتِينَ مِنْ كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ ﴿٢٧﴾ لِيَشْهَدُوا مَنَافِعَ لَهُمْ وَيَذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ فِي أَيَّامٍ مَعْلُومَاتٍ عَلَىٰ مَا رَزَقَهُمْ مِنْ بَهِيمَةِ الْأَنْعَامِ فَكُلُوا مِنْهَا وَأَطْعِمُوا الْبَائِسَ الْفَقِيرَ ﴿٢٨﴾ ثُمَّ لْيَقْضُوا تَفَثَهُمْ وَلْيُوفُوا نُذُورَهُمْ وَلْيَطَّوَّفُوا بِالْبَيْتِ الْعَتِيقِ ﴿٢٩﴾ ذَٰلِكَ وَمَنْ يُعَظِّمْ حُرُمَاتِ اللَّهِ فَهُوَ خَيْرٌ لَهُ عِنْدَ رَبِّهِ وَأُحِلَّتْ لَكُمُ الْأَنْعَامُ إِلَّا مَا يُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فَاجْتَنِبُوا الرِّجْسَ مِنَ الْأَوْثَانِ وَاجْتَنِبُوا قَوْلَ الزُّورِ ﴿٣٠﴾)) (الحج).

**حەج:**

ئەرکی پێنجەمە لە ئەرکەکانی ئیسلام بەپێی فەرمودەیی پێغەمبەر (د.خ): ((بني الإسلام على خمس شهادة أن لا إله الاالله و أن محمداً رسول الله، و إقام الصلاة، وإيتاء الزكاة، وصوم رمضان، وحج البيت من استطاع إليه سبيلا)). حەج فەرزە لەسەر هەر موسوڵمانێك کە توانای هەبێت وەك لە قورئاندا هاتووە: (وأذن في الناس بالحج.....) و حەج تەنها یەك جار لە تەمەن دا پێویستە.



حەج بۆنەیەکی ئاینییە کە لەپێش ئیسلام دا هەبووە. وەك موسوڵمانان حەج بە بۆنەیەکە کە خودای گەورە لەسەر نەتەوەکانی پێشوو وەك نەتەوەی (الحنفیة) شوێنکەوتوانی نەوەی ئیبراهیم (د.خ)، وەك لە قورئاندا باس کراوە: (وَإِذْ بَوَّأْنَا لِإِبْرَاهِيمَ مَكَانَ الْبَيْتِ أَن لَّا تُشْرِكْ بِي شَيْئًا وَطَهِّرْ بَيْتِيَ لِلطَّائِفِينَ وَالْقَائِمِينَ وَالرُّكَّعِ السُّجُودِ)، وخەڵك ئەم یادەیان دەکردەوە لە سەردەمی حەزرەتی ئیبراهیم و دوای ئەویش، بەڵام لە هەندێك بنەماکانی حەج جیاوازیان هەبووە، شتی زیادەیان بۆ دروست کردوە، بەڵام پێغەمبەر (د.خ) یەك جار حەجی کردوە لە حەجیماڵئاوایی دا لە ساڵی (١٠)ی کۆچی لەو حەجەدا پێغەمبەر (د.خ) هەموو کارەکانی حەجی بەرێك و پێکی ئەنجام داوە و فەرمویەتی :(شێوازی حەج کردن لەمن وەرگرن) پێغەمبەر (د.خ) لەو حەجەدا گوتارە بەناو بانگەکەی خوێندەوە، هەموو بنەماکانی ئاینی ئیسلامی تێدا چەسپاندوە.

حەج لە ساڵی (٩)ی کۆچی دا فەرزکرا ، کە پێویستە موسوڵمان لە تەمەنی دا تەنها یەك جار حەج بکات. ئەگەر موسوڵمانێك جارێك زیاتر چوو بۆ حەج ئەوە بە سوننە وخۆبەخش بۆی دائەنرێت. وەك لە ئەبوهورەیرەوە گێردراوەتەوە کە پێغەمبەر (د.خ) فەرمویەتی: ((خەڵکینە خودای گەورە حەجی لەسەر فەرزکردووین بچن بۆ حەج)) یەکێك لە هاوەڵەکانی پێی گوت: هەموو ساڵێك بچین؟ پێغەمبەر(د.خ) وەڵامی نەدایەوە تا دووجار پرسیاری کرد دوای ئەوە فەرمووی: ئەگەر بمگوتبایە بەڵێ فەرز ئەکراو ئێوەش پێتان نەدەکرا جێبەجێی بکەن.

## مەرجەکانی حەج کردن:

١- ئیسلام بوون: واتای دروست نیە خەڵکی غەیری موسوڵمان حەج بکەن.

٢- ژیری: چونکە حەج لەسەر شێت ئەرك نیە هەتا چاك دەبێتەوە.

٣- بالغ بوون: چونکە حەج لەسەر منداڵ ئەرك نیە.

٤- ئازادی: حەج لەسەر کۆیلە ئەرك نیە بەڵام ئەم مەرجە ئێستا نەماوە.

٥- توانا: بە واتای ئەوەی حەج لەسەر موسوڵمانێك ئەرکە، توانای جەستەیی و دارایی هەبێت.

## پاداشتی حەج:

لە پێغەمبەرە (د.خ) فەرمودە گێردراوەتەوە کە باس لە بەرزی و پیرۆزی حەج دەکات، وباسی ئەو پاداشتە دەکات کە موسوڵمان بە دەستی دێنێت لە بەجێهێنانی روکنێك لە روکنەکانی ئیسلام کە فەرموویەتی: (( تابعوا بين الحج والعمرة، فإنهما ينفيان الفقر والذنوب كما ينفي الكير خبث الحديد والذهب والفضة، وليس للحجة المبرورة ثواب إلا الجنة )). واتە: بەردەوام بن لەسەر حەج و عومرە، چونکە هەژاری و گوناه رەش دەکەنەوە، وەك چۆن ئاگری کورە چڵك و پیسی لەسەر ئاسن و زێر و زیو لادەبات. و لە ئەبو هوریرەوە گێردراوەتەوە کە دەڵێت: ((گوێم لە پێغەمبەر بووە (د.خ) فەرمویەتی: (( من حج، فلم يرفث ولم يفسق، رجع من ذنوبه كيوم ولدته أمه)).. واتە: ئەو کەسەی حەج بکات و نەچێتە سەر جێی هاوسەری و خراپە نەکات وەك ئەو رۆژەی لە دایك بووە لە گووناه پاك دەبێتەوە.

## جۆرەکانی حەج:

حەج بە پێی سروشتی جێبەجێکردنی دەکرێت بەسێ جۆرەوە:

١- حەجی (چێژ بینین – التمتع):

ئەوەیە کە حاجی یەکەم جار نیەتی عومرە بهێنێت ئەویش لە رۆژانی (١٠)یەکەمی مانگی (ذوالحجة) ئینجا لە (میقات) جلی ئیحرام لەبەربکات بڵێ (لبيك بعمرة) دوای ئەوە حاجی بچێت بۆ مەککە دوای گەیشتنی کاروباری (طواف) و (سعي) تەواو بکات و جلی ئیحرام دابکەنێت لە (تقصير) و دوای ئەوە هەموو شتێکی بۆ هەیە تەنانەت ژنەکەشی، بەم شێوەیە دەمێنێتەوە هەتا رۆژی (٨)ی (ذو الحجة) جارێکی دیکە ئیحرامی حەج دەپۆشێت و کاروبارەکانی دیکەی حەج کردن لە وەستان لە عەرەفە و (طواف) و (السعي) تەواو دەکات بەم شێوەیە حەجی تەواوی بۆ دەنوسرێت.

٢- حەجی پێکەوە (القران):

ئەوەیە کە حاجی لەگەڵ لەبەر کردنی پۆشاکی ئیحرام نیەتی حەج و عومرە پێکەوە بهێنیت بڵێ (لبيك بحج و عمرة) ئینجا دەچیتە مەککەو (طواف)ی هاتن دەکات و بە پۆشاکی ئیحرامەوە دەمێنێتەوە تاکاتی هاتنی حەج، دوای ئەوە کاروباری وەستان لە عەرەفە و شەیتان رەجم کردن تەواو دەکات و لەسەری نیە جارێکی دیکە (طواف) و (سعي) عومرە دوبارە بکاتەوە و لە (مسلم) گێردراوەتەوە کە پێغەمبەرە (د.خ) بە عائیشەی فەرمووە:((طوافك بالبيْت وبين الصفا والمروة يكفيك لحجك وعُمرتك)).

### ٣- حەجی تەنها (الافراد):

ئەوەیە کە حاجی نیەتی حەج بهێنێت لە کاتی پۆشینی ئیحرام تەنها بڵێت (لبیك بحج) ئینجا دەچێتە مەککە و (طواف) دەکات و هەتا کاتی حەج بە ئیحرامەوە دەمێنێتەوە کاروباری حەج جێبەجێ دەکات، کە تەواوبوو پۆشاکی ئیحرام دادەکەنێت کە لە مەککە دەرچوو جارێکی دیکە پۆشاکی ئیحرام دەپۆشێت بە نیازی (عومرە) و کاروباری عومرە جێبەجێ دەکات.

## وانەی بیست و دووەم

**خوای گەورە فەرموویەتی :** ((وَأَتِمُّوا الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ لِلَّهِ فَإِنْ أُحْصِرْتُمْ فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ وَلَا تَحْلِقُوا رُءُوسَكُمْ حَتَّى يَبْلُغَ الْهَدْيُ مَحِلَّهُ فَمَنْ كَانَ مِنْكُمْ مَرِيضًا أَوْ بِهِ أَذًى مِنْ رَأْسِهِ فَفِدْيَةٌ مِنْ صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ فَإِذَا أَمِنْتُمْ فَمَنْ تَمَتَّعَ بِالْعُمْرَةِ إِلَى الْحَجِّ فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ فِي الْحَجِّ وَسَبْعَةٍ إِذَا رَجَعْتُمْ تِلْكَ عَشَرَةٌ كَامِلَةٌ ذَلِكَ لِمَنْ لَمْ يَكُنْ أَهْلُهُ حَاضِرِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ ۝١٩٦ الْحَجُّ أَشْهُرٌ مَعْلُومَاتٌ فَمَنْ فَرَضَ فِيهِنَّ الْحَجَّ فَلَا رَفَثَ وَلَا فُسُوقَ وَلَا جِدَالَ فِي الْحَجِّ وَمَا تَفْعَلُوا مِنْ خَيْرٍ يَعْلَمْهُ اللَّهُ وَتَزَوَّدُوا فَإِنَّ خَيْرَ الزَّادِ التَّقْوَى وَاتَّقُونِ يَا أُولِي الْأَلْبَابِ ۝١٩٧ لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَنْ تَبْتَغُوا فَضْلًا مِنْ رَبِّكُمْ فَإِذَا أَفَضْتُمْ مِنْ عَرَفَاتٍ فَاذْكُرُوا اللَّهَ عِنْدَ الْمَشْعَرِ الْحَرَامِ وَاذْكُرُوهُ كَمَا هَدَاكُمْ وَإِنْ كُنْتُمْ مِنْ قَبْلِهِ لَمِنَ الضَّالِّينَ ۝١٩٨ ثُمَّ أَفِيضُوا مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ النَّاسُ وَاسْتَغْفِرُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ ۝١٩٩ فَإِذَا قَضَيْتُمْ مَنَاسِكَكُمْ فَاذْكُرُوا اللَّهَ كَذِكْرِكُمْ آبَاءَكُمْ أَوْ أَشَدَّ ذِكْرًا فَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَقُولُ رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا وَمَا لَهُ فِي الْآخِرَةِ مِنْ خَلَاقٍ ۝٢٠٠))(البقرة).

### کات و مانگەکانی حەج:

کاتی حەج کردن بریتییە لەو رۆژە دیاری کراوانەی کە حەجیان تیادا دەکرێت. بەڵام شوێنەکان ئەو شوێنانە دەگرێتەوە کە پێغەمبەرە (د.خ) دیاری کردون بۆ پۆشینی جلی ئیحرام بۆ ئەو کەسانەی کە دەیانەوێ (حەج و عومرە) بەیەکەوە جێبەجێ بکەن. ئەویش بەم شێوەیە:

### ئیحرام:

ئیحرام پۆشین روکنی یەکەمە لە ئەرکەکانی حەج، ئەویش نیەتی چونە حەج هاوکات بەکارکردنی کارەکانی حەج وەك (تلبية) واتا گوتنی (لبيك اللهم لبيك....)

ئەویش یەکێکە لە پێویستیەکانی ئیحرام. و ئەو کەسەشی واز لەم روکنە بهێنێت لە سەریەتی (ئاژەڵێك بکاتە قوربانی) یان (سێ رۆژ بەرۆژوو بێت) یان (شەش موسوڵمان تێر بکات).

ئەگەر موسوڵمان گەیشتە (میقات) دروستە نینۆکەکانی بکات و مووی زیادە لە لەشی بکاتەوە، ئینجا خۆی بشوات و دەست نوێژ بگریت و جلی ئیحرام بپۆشێت کە بریتییە لە جلی ئیحرام پۆشینی سەرشان و لەش بەپۆشاکی سپی پاك، بەڵام ژن هەر بەرگێك بپۆشێت بە ئارەزووی خۆی بە مەرجێك لەشی داپۆشێت بە بێ گوێ دانە ڕەنگێکی تایبەت. بەڵام خۆی بەدور دەگرێت لە پۆشینی دەستکێش و پەچە.

دوای ئەوە دوو رکات نوێژی ئیحرام بەستن دەکات و نیەتی حەج کردن دەهێنێت.



ئەگەر حاجی لە ئیحرام تەواو بوو دەچێت بۆ میقات، کە گەیشتە شاری مەککە دەڵێت (خودایە ئەمە حەرەم و پانەگەی تۆیە خوێن و گۆشتم لە ئاگر بپارێزە و لە ئازار بە دوورم خە، رۆژی زیندوکردنەوەی لە بەندە باشەکانت و پیاو چاك و خەڵکی خودا پەرست هەژمارم بکە ئەی خودای هەموو خەڵك) و کە چووە (مسجد الحرام) دەڵێت: (لا إلـه إلاّ الله و الله أكبر اللهم أنت السلام ومنك السلام تباركتَ ياذا الجلالِ والإكرام، اللهم زد هذا البيت تشريفاً وتعظيماً وتكريماً ومهابةً ورفعةً و براً، وزد من زارَهُ شرفاً وتعظيماً وتكريماً ومهابةً ورفعةً وبراً).

### رۆژی ئاودێری ( یوم الترویه ):

رۆژی (الترویة) رۆژی (٨)ی مانگی (ذي الحجة)یە، و بەم ناوە ناونراوە چونکە خەڵکەکە ئاوی تەواوە دەخۆنەوە لە مککەوە ئاو لەگەڵ خۆیان هەڵدەگرن و دەچن بۆ (منی). چونکە مانەوە لە (منی) سونەتە واجب نیە، چونکە ئەگەر حاجی چوو بۆ (عەرەفە) و لە (منی) نەمایەوە لە شەوی (٩)یەمدا زەرەری نیە، هەروەها جێ نوێژی نیوەرۆ عەسر و ئێوارە و خەوتنان کورت دەکاتەوە. بە واتای کە هەموو نوێژەکان کۆدەکاتەوە، و شەو لەوێ دەمێنێنەوە، دوای ئەوە حاجی نوێژی بەیانی دەکات و لە (منی)وە دەچێت بۆ (عرفة) بۆ بەسەربردنی (رۆژی حەجی گەورە).

### رۆژی عەرەفە :

رۆژی عەرەفە (٩) مانگی (ذي الحجة) یە، و یەکێکە لە گرنگترین روکنەکانی حەج، عەرەفە دەکەوێتە رۆژهەلاتی شاری مککە، لە رۆژی (٩)ی (ذي الحجة)دا حاجیان لە (منی)وە دەکەونە رێ بەرەو (عەرەفە) بۆ راوەستان. و ئەو راوەستانە دێتەدی لە وەستان لە هەر بەشێك لە بەشەکانی (عەرەفە) بە پیادە بێت یان بەسواری یان بەراکشاوی، و ئەگەر حاجی نەوەستێت لە سنوری عەرەفەدا حەجەکەی بەتاڵ دەبێتەوە، راوەستان لە عەرەفە یەکێکە لە گرنگترین روکنەکان بەپێی فەرموودەکەی پێغەمبەر (د.خ) کە فەرموویەتی: (الحج عرفة) وکاتی وەستان لە عەرەفە لە نیوە رۆی ئەو رۆژەوە دەست پێ دەکات هەتا بەرەبەیانی رۆژی داهاتوو کە یەکەم رۆژی جەژنی قوربان دەکات، کە تیایدا حاجی نوێژی نیوەڕۆ وعەسر بە (جمع تقديم)دەکات بەیەك بانگ و دوو قامەت کردن، و دەبێت حاجی رۆژی عەرەفە زۆر دوعا و پاڕانەوە بکات و (تلبية)بکات.

وەك پێغەمبەر (د.خ) فەرمویەتی: (باشترین پاڕانەوە پاڕانەوەی رۆژی عەرەفەیە و باشترین شتێك من و پێغەمبەران گوتومانە (لا إله الاّ الله وحدهُ لاشريكَ له، لهُ الملك ولهُ الحمد وهو على كل شيء قدير).

حاجیان تا رۆژ ئاوابوون دەمێننەوە و دوای رۆژ ئاوابوون دەچن بۆ (مزدلفة) بۆ شەو مانەوە لێی و حاجیان نوێژی (ئێوارە و خەوتنان دەکەن)بە (جمع تأخير) بە واتای دواخستنی نوێژی (ئێوارە) تا کاتی (خەوتنان) و دروستە حاجی پاڕانەوەی زۆر ئەنجام بدات، وهەروەها حاجی بەرد کۆ دەکاتەوە کە ژمارەی (٧بەرد). لە دەنکە نۆك گەورەتر و لە

جەخت بچوکتر بێت) ئەو شەوە لە (مزدلفة) دەمێنێتەوە و بەرەبەیان دەکەوێتە رێ بۆ (منـی) بۆ رەجم کردنی شیتانی گەورە (واتە: بەرد باران کردنی شەیتان).



## جەژنی قوربان:

رۆژی (دەیـەم) لـە مـانگی (ذي الحجـة) یەکـەم رۆژی جـەژنی قوربانـە، دوای نوێـژی بـەیانی حاجیـان لـە (مزدلفـة) دەکەونـە رێ بـۆ (منـی)و شـەیتان رەجـم کـردن. کـاتی رەجـم کردنەکـە لەبەرە بەیانی جەژنی قوربانەوە دەست پێ دەکات هەتا بەرەبەیانی رۆژی داهاتوو.

کە حاجی لە رەجمکردن دەبێتەوە قوربانیەك سەر دەبڕێت کە بریتییە لە (حوشتر یـان مانگا یان مەڕ) و قوربانی واجبە لەسەر هەموو حاجیەکی (متمتع) یان (القارن) و دروستە لە کاتی قوربانیەکـەدا بڵێت: ((بسم الله والله أكبر اللـهم منـك ولـك، اللـهم تقبـل مـني)).دوای ئـەوەی قوربانیەکـە دەکـات، سـەری دەتاشـێت یـان کـورتی دەکاتـەوە، و تاشـین باشـترە لـە کـورت کردنـەوەی چـونکە پێغەمبـەر (د.خ) سـێ جـار داوای رەحمـەتی بـۆ ئەوانـە کـردوە کـە سـەر دەتاشن تەنها یەك جار داوای رەحمەتی بۆ ئەوانە کردووە کە کورتی دەکەنەوە.

بەڵام ئافرەت تەنها کورتی دەکەنەوە، دوای رەجمی شەیتان و قژکورت کردنـەوە بۆ حـاجی هەموو شتێك دروستە بیکات، وەك چوونە لای هاوسەری، و بەمە دەوترێت حەڵاڵی یەکەم کە حاجی تیایدا دەتوانێت ئیحرام داکەنێت و خۆی بۆن خۆش بکات و جوانترین جل و بـەرگ لەبەر بکات.



له دوای ئەو کارانەی پێشو حاجی دەچێتەوە بۆ مەککە بۆ ئەوەی (طواف الأُفاضة) بکات کە ئەویش یەکێکە لە روکنەکانی حەج، وەك لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە :(( ثُمَّ لْيَقْضُوا تَفَثَهُمْ وَلْيُوفُوا نُذُورَهُمْ وَلْيَطَّوَّفُوا بِالْبَيْتِ الْعَتِيقِ)) دوای ئەوە دوو رکات نوێژ دەکات لە مەقامی ئیبراهیم و دروستە ئاوی زمزم بخواتەوەو ئینجا حاجی سەفا و مەروە دەکات بە مەرجێك حاجی بە (تمتع) حەجی کردبێت چونکە راکردن لە نێوان سەفا و مەروەی بۆ عومرە کردوە، بەڵام ئەم راکردنە بۆ حەجەکەیەتی. دوای ئەوە حاجی ئیحرام دەشکێنێت و دەتوانێت هەموو کارێك ئەنجام بدات کە لێی قەدەغەکرابوو، تەنانەت چوونە لای هاوسەریشی، دوای ئەوە حاجی دەگەڕێتەوە بۆ (منى) بۆ مانەوەی رۆژانی (تشريق).

### رۆژانی تەشریق ( أيام التشريق ):

سێ رۆژی یەکەم دوای قوربانی کردن، کە رۆژانی (١١، ١٢، ١٣)ی مانگی (ذي الحجة) دەکات. لەم ٣ رۆژەدا حاجی سێ رەجمی شەیتان دەکات بچوك و ناوەند و گەورە. لە دوای لادانی رۆژ لە نیوەڕۆ هەتا رۆژ ئاوابوون و لە هەموو رەجمێك دا حاجی (٧ بەرد) فڕێ دەدات ولەگەڵ هەموو بەرد فڕێدانێك دا (الله أكبر) دەکات.

### تەوافی خوداحافیزی ( طواف الوداع ):

دوای تەواوبوونی حاجی لە رەجم کردن و گەرانەوەی لە (منی) ونیازی جێهێشتنی مەککە و گەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆی پێویستە لە سەری (طواف)ی خوداحافیزی بکات ئەویش بە سوڕانەوە بە دەوری کەعبەدا (٧ جار) و نوێژ کردن لە پشت مەقامی ئیبراهیم دوو رکات بۆ ئەوەی دوا مەنزڵگەیان (مسجد الحرام) بێت پێش ماڵ ئاوایی کردن.

### گفتوگۆ:

١- مەرجەکانی حەج کامانەن؟

٢- جۆرەکانی حەج بژمێرە و جیاوازیان چییە؟

٣- روکنەکانی حەج کامانەن و گرنگترینیان کامەیە؟ بە بەڵگەی فەرمودەیەکی پێغەمبەرەوە باسی بکە؟

٤- ئەو شتانە چین کە لەسەر حاجی قەدەغە دەکرێن دوای پۆشینی بەرگی ئیحرام؟

٥- مەبەست لە رۆژانی تشریق چییە و کاتەکەیان چ کاتێکە؟ وحاجی لە رۆژانی (تشریق)دا چی دەکات؟

## وانەی بیست و سێیەم

### دادوەری لە ئیسلام دا

ئیسلام فەرمان بە دادوەری دەکات لە بڕیار داندا و بەڵگەش لەسەر ئەمە ئایەتی﴿...وَإِذَا حَكَمْتُمْ بَيْنَ النَّاسِ أَنْ تَحْكُمُوا بِالْعَدْلِ...﴾ (النساء٥٨).

کەهانی موسوڵمانان دەدات بۆ دادوەری، وەك هۆیەك بۆ گەیشتن بەخودا پەرستی و باوەڕ بەپێی ئایەتی ﴿...اعْدِلُوا هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى...﴾ (المائدة٨).

هەموو گەلان لە سەدەی نوێدا داوای دادوەری دەکەن و خۆ بەخت دەکەن لە پێناو بەدیهێنانی، لەبەر ئەوەی دەزانن کە ژیان بەبێ دادوەری هیچ واتایەك نا بەخشێت.

### ژیان لە سایەی دادوەری دا :

ژیانی خەڵك لە وڵاتێکی پڕ دادوەری دا بەمانە دەناسرێت:

١- ئاسایش جێی ترس دەگرێتەوە.
٢- ڕەزامەندی جێی توڕەیی دەگرێتەوە.
٣- سەر بەرزی جێی سەر شۆڕی دەگرێتەوە.
٤- ئارامی جێی سەرلێشێوان دەگرێتەوە.
٥- بەختەوەری جێی بەد بەختی دەگرێتەوە.
٦- یەکسانی جێی جیاوازی دەگرێتەوە.

### سیفەتەکانی فەرمان ڕەوای دادوەر :

١- خاوەن دەرونێکی پاکژ.
٢- خاوەن بەزەیی.
٣- خاوەن دانایی و ئارامی.
٤- دوور لە زوڵم کردن.
٥- چۆك نەدان بۆ مەیل و ئارەزووەکان.
٦- یەکسانی پارێز لە بەرامبەر خەڵك دا و تەماشاکردنیان بەیەك چاو، بێ جیاوازی لە نێوان هەژار و دەوڵەمەند.

٧- ڕاوێــژ بــە خــەڵکی دەکــات و گــوێ لــە بــۆ چــوونەکانیان دەگرێــت. خــودای گــەورە دەفەرموێت: ﴿...وَشَاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ...﴾ (آل عمران١٥٩).

٨- ئازادی دەداتە هەموو ئەندامێك لە ئەندامانی نەتەوەکەی، بۆ ئەوەی هەڵبـژاردن بکەن و خۆیان بناغەی وڵاتیان دامەزرێنن.

## ئەو لایەنانەی کە دادوەری ئیسلام دەیانگرێتەوە:

١- مـافی هـەژار و نـەدارەکان بـە خـەرج کردنـی پـارەی پێویسـت بۆیـان لەسـەر مایـەی زەکـات و خێروچاکە.

٢- مافی بێکارەکان بە دابینکردنی کاری گونجاو بۆیان بەپێی توانایان.

٣- مافی پیر و پەککەوتەکان بە دابین کردنی ژیانێکی بەختەوەرانە.

٤- مافی هەتیوان بە پارێزگاری کردنی سەروەت و سامانیان و ڕێگرتن لە داگیرکردن و خواردنی.

٥- مافی بێوە ژنان بە دابین کردنی ژیانێکی سەربەرزانە.

٦- مافی منداڵان لەسەر شانی باوکان.

٧- مافی دەوڵەمەندان بە پارێزگاری کردنی موڵك و سەروەت و سامانەکانیان.

مـافی شـوێنکەوتوانی ئاینـەکانی دیکـە بـەڕێزگرتنی دیـد و بۆچـون و پەرسـتگە و بۆنـەکانیان و دوور کەوتنەوە لە هەموو هێرش کردنە سەریان، چونکە ئیسلام داوای ئەوەمان لـێ دەکات وەك خودای میهرەبان دەفەرموێت: ﴿...وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا...﴾ (الحجرات١٣).

## ئەو کاتانەی کە دادوەر ناتوانێت بڕیاریان تێدا بدات:

ئەگـەر مـرۆڤ ، لـە بـاری ئاسایی و لەسـەر خۆی دابـوو ئـەوەی بڕیـاری لەسـەر دەدات تـەواوە، چونکە ئەقڵی لـە باری ئاسایی خۆیدایە، بەڵام ئەگـەر ئـەو مرۆڤـە لـە بـاری تـوڕەیی و هەڵچوون دابـوو ئـەوا لایـەنی ئـەقڵی جـێگیر نابێـت و لەسـەریەتی کـە دادوەریـی نـەکات پێغەمبـەر (د.خ) دەفەرموێت: ((لایحکم احدٌ بین اثنین وهو غضبان)).

## پاداشتی فەرمانڕەوای دادوەر:

شوێنی دادوەران بەرزە لە لای خودای گەورە، چونکە ئـەوان دەبنـە ڕونـاکی ماڵـەکان لـە دنیـادا، خودای گەورەش ماڵـەکانی ئـەوان لـە ڕۆژی دواییدا ڕوونـاك دەکاتـەوە لـە بەهەشتدا. پێغەمبـەر (د.خ) دەیفـەرموو: ((إنَّ المقسـطین عنـد الله علـی منـابر مـن نـور، الـذین یعـدلون في حکمهـم، واهلیهم، وماوُلوا)) (رواه مسلم).

## گفتوگۆ:

پ١/

١- بەڵگەی ئایەتێك بهێنەرەوە کە ئیسلام هانی دادوەری دەدات؟

٢- ئایەتێك بنووسە لەسەر هاندانی موسوڵمانان بۆ (راوێژ کاریی لە فەرمانڕەوایی دا).

## پ٢/ هۆی ئەمانە بڵێ:

١- پایەی دادوەران لای خودا بەرزە.

٢- ئەگەر مرۆڤ، لە باری سروشتی خۆی دا بوو ئەوەی بریاری لێ دەدات تەواو راستە.

٣- فەرمانڕەوای دادوەر تەواوی ئازادی دەدات بە هەموو ئەندامانی نەتەوەکەی.

## پ٣/ وەڵامی راست لە ناو کەوانەکاندا هەڵبژێرە:

١- فەرمانڕەوای دادوەر خاوەن دەرونێکی پاکژە لە ناخی دا و.................. .

(چاکەی تیا نیە، پیسی تیا نیە)

٢- فەرمانڕەوای دادوەر خاوەن دەرونێکی پاکە...................... .

(خواری تیادا نیە، راستی تیادا نیە)

٣- فەرمانڕەوای دادوەر خاوەن دەرونێکی پاکژە لە بۆچونی دا.............. .

(شێتی تیا نیە، ژیری).

## پ٤/ نیشانەی راست بەرامبەر دەستەواژەی راست و نیشانەی هەڵە بەرامبەر دەستەواژەی هەڵەکان دابنێ:

١- فەرمانڕەوایی دادوەر بەهۆی ئەو بەزەیی و سۆزەی لە دڵی خۆی گرتووە بەزەیی بە خەڵك دا دێتەوە.

٢- فەرمانڕەوای دادوەر بەهۆی ئەو بەزەیی و سۆزەی لە خۆی گرتووە نانی خەڵك دەبرێت.

٣- فەرمانڕەوای دادوەر مل کەچی هەوەس و ئارەزوەکانی نیە.

## وانەی بیست و چوارەم

# پیاوانێك خزمەتی ئیسلامیان کردووە

## سەلاحە ددین ئەیوبی

نەتــەوەی ئیســلام بــە هــەموو گــەل و نەتــەوەکانی هاوکــاری کــردوە لــە بنیاتنــانی شارستانێتی ئیسلامی دا. و لەو گەلانەش گەلی کوردە. و مێژووی ئیسلام گەواهی رۆڵی کورد دەکات لە خزمەتی ئاینی ئیسلام و موسوڵمانانندا دەدات و چەندانێك لە زانا و بیرتیژ و سەرکردەی تیا هەڵکەوتووە، کە زۆریان پێشکەش کردوە بە ئیسلام و مرۆڤایەتی و بە دڵسۆزی پارێزگاریان لە پیرۆزیەکانی کردوە و رێزی موسوڵمانانیان ریکخستوە بەرامبەر بە زوڵم و زۆری داگیرکەران و بەزیندویی لەویژدان و ئەقڵی خاوەن ویژدانەکان دا یادیان ماوەتەوە، و یەکێك لەو پایە بەرزانە سەلاحە ددینی ئەیوبی بووە.



### ژیانی:

ناوی یوسف کوڕی ئەیوب نازناوی (سەلاحە ددین)ی وەرگرتوە، بنەچەکەی دەگەڕێتەوە بۆ خێزانێکی بەڕێز و گەورە کە لە هۆزی (هزبان – هۆزەبان)ی گەورە و ناسراوە لە کوردستان و ئەو خێزانە بەڕێزە کۆچیان کردوە بۆ وڵاتی شام و عێراق، لە دمەشق و بەغدا و تکریت نیشتەجێ بوون، کە سەلاحە ددین تیایدا لە دایك بووە لە ساڵی (٥٣٢ ك) و ئەو کاتە باوکی فەرمانڕەوای ئەوێ بووە.

چونەتە ژێر سایەی ئاینی ئیسلامەوە بەهۆی باوەڕیان بە دادوەری (بەرزی و پیرۆزی ئاینەکەوە و بە توانای تەواوەوە بەشداری و خزمەتی ئیسلامیان کردوە وبونەتە هۆی چەسپاندنی پایەکانی یەکێتی و یەکگرتوی ئاینی ئیسلام و پارێزگاری کردنی.

## گەورە بوونی:

پەروەردەیەکی چاکی وەرگرتووە و گەورە بووەو، زانستی قورئان و فەرمووده و شەریعەتی ئیسلامی لەسەر دەستی کەڵە زاناکان تەواو کردوە و فێری بەکارهێنانی چەك و سوارچاکی بووە، وبووە بە یەکێك لە کەم وێنەکان لە ئازایەتی دا. و بە توانای کەسێتی زۆرێك لە پلەی ئیداری و سەربازی بە دەست هێناوە لەوانە ( لێپرسراوی پۆلیس و سەرکردەی سەربازی و وەزیر و جێگری سوڵتان و سوڵتان.

## ڕەوشتی:

مێژووی ئیسلامی ئاشنای کەمێکی وەك سەلاحە ددین نەبوو بوو، دوای جێنیشینەکانی ئیسلام، لەبەر ئەوەی جیهانی بە ڕەوشتە بەرزەکانی سەرسام کردبوو کە ئەم ڕەوشتانەن:

١- جێبەجێکردنی پەیمان و پیاوەتی و بەخشین.

٢- لێ بوردەیی و مامەڵەی بەرزی مرۆڤانەی لەگەڵ دیل و گیراوەکانی شەڕ لە جەنگاوەران.

٣- نزیك بونەوە لە زاناکان و گرنگی دان بەسەرجەم زانستەکان.

٤- زۆر سادە دەژیا و حەزی لە ماڵ و کۆشك و کۆ کردنەوەی پارە نەبوو و جل و بەرگی زۆر ئاسایی بوو.

٥- بە دەست پاکی دەناسرا، کە لە ساڵی (٥٨٩ ك) کۆچی دوایی کرد تەنها (١٧ حەڤدە درهەمی) لە دوای خۆی بەجێهێشت.

## ئازایەتی و کارە بەجێ هاتووەکانی:

هەموو ژیانی بریتی بوو لە خۆبەخت کردن لە پێناو خۆدا و نەتەوەی ئیسلام دا و هەر لە تەمەنی منداڵییەوە هەتا گەورەیی لە چەندەها شەڕی گەورەدا بەشداری کردووە لە پێناو ئیسلام دا، و یەکێك بووە لەسەرکردە سەر بازییە گەورەکان و ناسراوە بە داڕشتنی پلانی سەربازی و کەڵە سیاسییەکی بەتوانا بووە.

## گرنگترین کارەکانی:

١- دامەزراندنی دەوڵەتی ئەیوبی کە بووە هۆی یەکگرتنی وڵاتی میسر و شام و حیجاز و یەمەن.

٢- سەرکەوتنی بەسەر دوژمنان دا لە شەڕی (حطین)ی بە ناوبانگدا.

٣- (قودس)ی رزگار کرد و لە ساڵی (٥٨٣ك) چووە شاری (قودس)ەوە و کەسی دووەم بووە دوای عومەری کوڕی خەتاب کە (قودس)ی رزگار کردبێت.

## گفتوگۆ:

**ئەمانە تەواو بکە:**

١- سەلاحە ددینی ئەیوبی لە شاری .............. لە دایك بووە لە ساڵی ........ . و سەلاحە ددین لە خێزانێکی .............. دەژمێردرێت کە سەر بە هۆزی ............ و ناوی ......... کوڕی ....... .

٢- ئەو پلە و پایانە چین کە سەلاحە ددین بە دەستی هێناوە:

_____________ ، _____________ ، _____________ ، _____________.

٣- بەڵگە لەسەر ئازایەتی سەلاحە ددین چییە؟

٤- لە گرنگترین کارەکانی سەلاحە ددین بلێ لە کاتی حوکمڕانی دا.

٥- هەندێك لەو رەوشتانە بژمێرە کە بە سەلاحە ددین تایبەتمەندبن.



## وانەی بیست و پێنجەم

# جگەرە کێشان و زیانەکانی

دایکی عومەر پێشوازی لە عومەر دەکات کە لە قوتابخانە گەڕاوەتەوەو ماچی دەکات.

**دایك:** عومەر بۆنی جگەرەت لێ دێت.

**عومەر:** دایە گیان هاوڕێیەکم زۆری لێکردم کە لە دوای دەوام جگەرەیەك بکێشم.

**دایك:** قەت چاوەڕوانم نەدەکرد ئەم کارە خراپە ئەنجام بدەیت. نازانی کە جگەرەکێشان دەردێکی ترسناکە لەسەر مرۆڤ، و کۆمەڵ، و کاریگەری خراپی هەیە لەسەر لایەنە تەندروستی و دەرونی و کۆمەلایەتیەکان، و ئاینی ئیسلامی پیرۆز ڕێگرە لە ئازار دانی جەستەی خۆمان و خەڵك و فەرمانمان پێ دەکات بە دور کەوتنەوە لە خراپەکان هەر چەندە بچوك و کەمیش بن بە پشت بەستن بە فەرموودەکەی پێغەمبەر (د.خ): **((اياكم ومحقرات الذنوب))** جگەرەکێشانیش لە گوناهە بچوکەکانە کە زیان بە تەندروستی گشتی دەگەیەنێت و دەبێتە هۆی بەفیرۆدانی پارە.

ئەگەر خودای گەورە ئەو هەموو نیعمەتە باشانەی پێ بەخشیوین بۆ سوودیان لێ وەرنەگرین. چونکە لاشەمان سپاردەیەکی خودایە و دەبێت پارێزگاری لێ بکەین.

چونکە دوکەڵ زیانبەخشە بە لاشەی مرۆڤ، و ئالەم ئایاتەدا هاتووە: ...وَلَا تَقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا﴾ (٢٩ النساء)



ئینجا دایکی دەستی عومەری کوڕی دەگرێت و دەیبات بۆ شوێنی تایبەت بە ئامێری کۆمپیوتەر. و شوێنی تایبەت بە زیانەکانی جگەرە لەسەر تۆڕی ئەنتەرنێت دەکاتەوە. و دایکی عومەر وێنەی توشبوان بە نەهامەتیەکانی جگەرە پیشانی کوڕەکەی دەدات.

ئەوەی سەرنجی عومەری ڕاکێشا لە کاتی گەڕاندا. ئەو ناونیشانە دیارە بوو کە باسی لە زیانەکانی جگەرەکێشان دەکرد بۆ منداڵان و گەنجان کە ئەم خاڵانەی لە خۆ گرتبوو:

١- زیان گەیاندن بەدڵ وسیەکان.

٢- تەنگە نەفەسی.

٣- کۆکەی بەردەوام.

٤- وەرینی موی سەر و بۆنی زۆر ناخۆش.

٥- زەرد بوونی ددانەکان.

لە کۆتایی دا عومەر سەیری دایکی کرد کە پەشیمانی بە دەم وچاویەوە دیاربوو، دەستی دایکی ماچ کرد و زۆر بەهێمنی پێی گوت دایکە گیان پەیمان بێت لە مڕۆ بە دواوە جگەرە ناکێشم.



### گفتوگۆ:

١- دایك بە کوڕەکەی گوت: قەت چاوەڕوانی ئەو کارە خراپەم لێ نەدەکردی. بۆچی؟

٢- ئاینی ئیسلام فەرمانی چیمان پێ دەکات؟

٣- بۆچونی ئیسلام بەرامبەر جگەرە کێشان چییە؟

٤- ئایەتێکی قورئانی پیرۆز بنووسە کە باس لە بەفیرۆدانی پارە دەکات؟

٥- ئەوەی دەیزانیت دەربارەی زیانەکانی جگەرە کێشان باسی بکە؟

٦- ئەمانە تەواو بکە:

ئـ- خودای گەورە بۆ مرۆڤ، ............ حەڵاڵ کردوە و داوامان لێ دەکات دور بکەوینەوە لە .......... .

ب - پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێت: ((إياكم و محقرات .............)).

پ - جگەرە کێشان دەردێکی ترسناکە لەسەر ............. .

ت - لە دەمی ......... بۆنێکی ناخۆش دێت.

### خۆم ڕادەهێنم لەسەر:

١- دورکەوتنەوە لەو شوێنانەی کە جگەرەی تێدا دەکێشرێت و هاوڕێیەتی جگەرەکێشان ناکەم.

٢- ئامۆژگاری هاوڕێیەکانم بە دورکەوتنەوە و خۆپاراستن لە جگەرە کێشان دەکەم.

### چالاکی:

مامۆستا و قوتابییەکان هەڵدەستن بە ئامادەکردنی پۆستەر و زانیاری ئاگادارکردنەوە بۆ هۆشیار کردنەوەی قەتابیان لە مەترسی جگەرەکێشان لەسەر تەندروستی مرۆڤ، و کۆمەڵگە قەدەغەکردنی لە لایەن شەرعەوە.

## وانەی بیست و شەشەم

### قەدەغەکردنی مادده هۆشبەرەکان

کێشەی مادده هۆشبەرەکان ترسناکترین کێشەی تەندروستی و کۆمەڵایەتی و دەروونییە کە بەرەو رووی جیهان دەبێتەوە.

(حەشیش و تلیاك و هیرۆیین) رووەکی سروشتین و بەرهەم هێنراوەکانیش کە دەبنە هۆی ژەهراوی بوونی مێشك. بە مادده هۆشبەرەکان دەناسرێن، ئاینی ئیسلام بەبێ سڵەمینەوە و ترس قەدەغەی کردون، چونکە دەچێتە خانەی خواردنەوە کحولیەکان. بۆیەش حەرام کراون، چونکە (مسکر – سەرخۆش کەرن) (مفتر – بێ هۆش کەرن).

پێغەمبەر (د.خ) داوای لێ کردوین لەم ماددانە دوور بکەوینەوە کە زیان بە لاشەی مرۆڤ دەگەیەنن ، جا لەرێ خواردنەوە بێت یان بۆنکرد بێت یان دەرزی لێدان بێت. (حەرامە) وەك خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَأَنْفِقُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلَا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ وَأَحْسِنُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ﴾ (البقرة ١٩٥).

چونکە ئەو کەسەی کە ژەهر دەخوات یان زیان بەلاشەی خۆی دەگەیەنێت گومانی تێدا نییە کە خۆی دەخاتە مەترسییەوە چونکە قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ) گشتگیر و سەرتاسەرین. یاساکانی گشتییە و ئەوەی بچێتە خانەی ئەو گشتییەوە ئەگەر بەناویش نەهاتبێت ئەو یاسایە دەیگرێتەوە. بۆیە زاناکان کۆکن لەسەر قەدەغەکردنی حەشیش و هاوشێوەکانی هەرچەندە بەناو نەهاتووە بە تایبەتی، بەڵام لەبەر ئەوەی لە زیان بەخشە بە خودی مرۆڤ، و تەندروستی گشتییەوە.

سەرجەم حکومەتەکان شەڕی مادده هۆشبەرەکان دەکەن و سزای زۆر توندیان داناوە بۆ ئەو کەسانەی کە بەکاری دەهێنن یان پڕوپاگەندەی بۆ دەکەن یان بازرگانی پێوەدەگەن. چونکە ئەوانە بازرگانی بە گیانی نەتەوەوە دەکەن. خودای میهرەبان دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا جَزَاءُ الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الْأَرْضِ فَسَادًا أَنْ يُقَتَّلُوا أَوْ يُصَلَّبُوا أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُمْ مِنْ خِلَافٍ أَوْ يُنْفَوْا مِنَ الْأَرْضِ ذَلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ فِي الدُّنْيَا وَلَهُمْ فِي الْآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ﴾ (المائدة ٣٣).

هەموو زانایانیش بەهەموو رەوتەکانیانەوە کۆکن لەسەر قەدەغەکردنی ماددەی هۆشبەر چونکە زیان بەخشە بە ئاین و ئەقل و سروشتی مرۆڤ، . و ئەوەی کە مرۆڤ، دوور دەخاتەوە لەم کارانە تەنها باوەڕهێنانە بە خودا کە گەورەترین ڕێگرە لە ئەنجامەدانی هەموو چەوتیەکان. و ئەوەی خۆی پڕچەك بکات بەباوەڕ ئەوە پارێزراوە لە زیانەکانی.

**گفتوگۆ:**

١- هۆکاری توش بوون بە بەکارهێنانی ماددەی هۆشبەر چییە؟

٢- زیانی ماددەی هۆشبەر چییە؟ هەندێکیان بڵێ؟

٣- گەورەترین ڕێگر بۆ دورکەوتنەوە لە مادەی هۆشبەر چییە؟

٤- چۆن دەوڵەتان دژایەتی مادە هۆشبەرەکان دەکەن؟

٥- ئایەتێکی قورئان بڵێ کە باس لە قەدەغەکردنی مادەی هۆشبەر دەکات؟

## وانەی بیست و حەوتەم

## قەدەغەکردنی مەی خواردنەوە

لە چاکەکانی ئاینی ئیسلام حەلاڵ کردنی خواردنە خۆشەکان و قەدەغەکردنی خواردنە زیان بەخشەکانە و ئەوەی ژیری لە دەست مرۆڤ، دەدات. و یەکێك لەو قەدەغەکراوانە (مەی – عەرەق) خواردنەوەیە کە مرۆڤ، لە سروشتی ژیری خۆی لادەبات.

چونکە قەدەغەکردنی لە ئیسلام دا پەیوەستە بە روداو و زەرەر و قورئان و فەرمودەکان بەڵگەی حاشا هەڵنەگرن لەسەر قەدەغەکردنی (مەی).

خودای دلۆڤان دەفەرموێت:

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالْأَنْصَابُ وَالْأَزْلَامُ رِجْسٌ مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ (المائدة ٩٠).

وە لە فەرموودەی پێغەمبەریشدا (د.خ) هاتووە

**((كل شراب اسكر فهو حرام)) ((وما اسكر كثيره فقليله حرام)).**

### هۆکارەکانی قەدەغەکردن:

١- کارێکی پیسی قیزەونەو تەنها لە کاری شەیتان دەچێت.

٢- دەبێتە هۆی دوژمنایەتی و دووبەریکی و شەڕ و ئاژاوە لە ناو خەڵکیدا.

٣- مرۆڤ، دور دەخاتەوە لە هەموو جۆرە خودا پەرستیەك و قورئان خوێندن و نوێژکردن و تەندروستی تێك دەچێت.

٤- یەکێکە لە زیان بەخشەکانە کە لە کەسێتی مرۆڤ، کەم دەکاتەوە.

٥- دەبێتە هۆی بەفیرۆدانی پارە.

تەنها مەی خواردنەوە حەرام نەکراوە. بەڵکو ئەوەی پەیوەندی پێوە هەیە. پێغەمبەرمان (د.خ) دەفەرموێت: **((لعن الله الخمر، وشاربها، ومعتصرها، وحاملها، والمحمول اليه، وآكل ثمنها))**.و لە قورئانیشدا (چوار) ئایەت هاتوونەتە خوارەوە بۆ ڕێگرتن لە خواردنەوەی مەی. و لە بەزەیی خودای گەورە بۆ بەندەکانی قەدەغەکردنی هەر شتێك بەیەکجار نەبووە و بەچەند جارێك بووە، بۆ ئەوەی موسڵمان بتوانێت فرمانەکانی خودای گەورە بە تەواوی جێبەجێبکات.

و له قورئان دا مەی حەرام کردن بە چوار قۆناغ بووە و چوار ئایەتی لەسەردا هاتووە کە موسڵمان دەگوازێتەوە لە قەدەغەکردنەوە بۆ قۆناغی حەرام کردن ئایەتەکانیش ئەمانەن:

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمِنْ ثَمَرَاتِ النَّخِيلِ وَالْأَعْنَابِ تَتَّخِذُونَ مِنْهُ سَكَرًا وَرِزْقًا حَسَنًا إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَةً لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾ (النحل ٦٧).

١- ئەمە یەکەم ئایەتە دەربارەی بابەتی (سەرخۆشی و مەی) هاتۆتە خوارەوە.

٢- خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ قُلْ فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَا أَكْبَرُ مِنْ نَفْعِهِمَا ...﴾ (البقرة ٢١٩). لەم ئایەتەدا باس لە خراپی (مەی) دەکات و هانی موسوڵمان دەدات بۆ دورکەوتنەوە لێی.

٣- قۆناغی سێیەم ئەویش حەرام کردنی (مەی) خواردنەوەیە لە کاتی نوێژەکاندا. بەهۆی ئەوەی کە یەکێك لە هاوڕێیانی پێغەمبەر (د.خ) پێش نوێژی بۆ هاوەڵەکانی دەکرد و بەهۆی سەرخۆشیەوە قورئانی بەغەڵەت بۆ خوێندنەوە و بۆ پێغەمبەریان گێڕایەوە و خودای گەورە ئەم ئایاتەی نارده خوارەوە: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَقْرَبُوا الصَّلَاةَ وَأَنْتُمْ سُكَارَى حَتَّى تَعْلَمُوا مَا تَقُولُونَ .....﴾ (النساء ٤٣). قۆناغی کۆتایی بە ئایەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالْأَنْصَابُ وَالْأَزْلَامُ رِجْسٌ مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ (المائدة ٩٠). لەم ئایاتەدا خودای گەورە تەواو (مەی) قەدەغە وحەرام کرد وە پێویستی کرد لەسەر هەموو موسوڵمانێك بەحەرامی بزانێت لێی دوربکەوێت، وەك لە کۆتایی ئایەتەکەدا هاتووە: ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُوقِعَ بَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاءَ فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَنْ ذِكْرِ اللَّهِ وَعَنِ الصَّلَاةِ فَهَلْ أَنْتُمْ مُنْتَهُونَ﴾ (المائدة ٩١).. هاوڕێیانی پێغەمبەر وەڵامی ئایاتەکەیان دایەوە و گوتیان (وازمان هێنا، وازمان هێنا).

**گفتوگۆ:**

١- هۆكاری قەدەغەكردنی مەی خواردنەوە چییە لە ئیسلام دا؟

٢- حیكمەت چییە لە حەرام كردنی مەی بەچەند قۆناغێك؟

٣- قۆناغەكانی حەرام كردنی مەی بژمێرە بە پشت بەستن بە ئایەتەكانی قورئان.

# ناوەڕۆك